خالید ئێرتوغروڵ

# سێڤدا

## ئازارەکانی ژیانی لاوێک







# سێڤدا

ئازارەکانی ژیانی لاوێك

نووسەر : خالید ئێرتوغروڵ
وەرگێڕ : پێشڕەو هیوا احمد
داڕشتنەوەی: بەهرە محمدعلی
نۆبەی چاپ : یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢٨٧٠)ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێ دراوە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
www.ara-m.com
ara.m@hotmail.com
0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669
بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی - شەقامی پیرەمێرد

# پێشەکی نووسەر

ئەم کتێبە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە. بەڵام لەسەر داوای ئەو کەسانەی بەشێکن لە چیرۆکەکە ناوی خوازراو بەکارهێنراوە.

ئەم ڕووداوە کەم وێنانەم ڕاستەوخۆ لە زمانی شایەتحاڵی ڕووداوەکانەوە وەرگرتوە و سەر لەنوێ دامڕشتوونەتەوە، بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری تێدا بکەم.

ئەم کتێبە باسی ژیانی پڕ دەرد و مەینەتی کچێکی عازەب دەکات کە شوێن خەیاڵ و ئارەزووەکانی کەوتووە.

زنجیرەی ڕووداوەکان هێندە کاریگەر و ناوازەن لەکاتی خوێندنەوەیاندا سەرسام دەبن و ناتوانن فرمێسکەکانتان ڕابگرن. لەوەش گرنگتر لەبەرامبەر ئەم هەموو ڕاستییە سەرسوڕهێنەرانەی ژیاندا هەست دەکەیت کاتی ئەوەیە چاوێك بەژیانی خۆتدا بخشێنیتەوە، بەتایبەتی کاتێك تێگەیشتی خۆشەویستی و عەشقی هەڵە، یان دەوروبەری خراپ چۆن مرۆڤ لەناودەبەن.

ئەم بەرهەمە چیرۆکێکی پڕ لە پەند و وانەیە و دوورە لە هەموو هەڵبەستراوێك، ڕووداوەکان چۆن ڕوویانداوە ئاوا نووسراون. لەبەر ئەم هۆیەشە نابێت لەڕووی ئەدەبییەوە وەك ڕۆمان و چیرۆك هەڵبسەنگێنرێت.

ئامانج لە نووسینی ئەم کتێبە یارمەتیدانی ئەو کەسانەیە کە لەنێو داڕووخانی مەعنەویدان، بەتایبەتیش گەنجان، لە ڕێگەی پیشاندانی نموونەی زیندوو و پڕ پەند و خستنەڕووی چارەسەر بۆ کێشەکان و، ڕووبەڕوو کردنەوەی کەسەکە لەگەڵ ڕووی ڕاستەقینەی دروستبوونیدا.

کتێبەکە خوێندکارانی بنەڕەتی و ئامادەیی کردووەتە ئامانج. لەبەر ئەوە هەوڵدراوە کە لە نووسینیدا شێوازێکی سادەو ڕەوان بەکاربهێنرێت و، لەبری ئەوەی ڕۆمان یان چیرۆك بێت کۆمەڵە ڕووداوێکە لە ڕاستییەکانی ژیان وەرگیراون و پەیامێکیشە بۆ ژیان.

دڵنیاشین لەگەڵ خوێندنەوەیدا، هەوڵ دەدەن هاوڕێکانیشتان بیخوێننەوە.

ئەگەر دەتانەوێت خۆتان لە ئاوێنەی ژیاندا ببیننەوە، تکایە فەرموون...

خالید ئێرتوغروڵ

# تەلەفۆنێکی پڕ نهێنی



ڕۆژێکی یەك شەممە بوو. سەر مێزەکەم پڕ بوو لەو نامە پڕ مانایانـەی لە خوێنەرەکانمەوە بۆم دەهاتن و بەڕاستی لە ناویاندا نوقم بووبووم، لەناو دونیای پڕ نهێنی و بە ئازاری ئەو چیرۆکانەدا بە دەنگی تەلـەفۆنێك بـەئاگا هـاتم. ئـەوەی قسـەی لەگەڵـدا کـردم خاتوونێـك بـوو هێنـدە بـە جـۆش و خرۆشەوە قسەی لەگەڵدا کردم هەستم کرد خەریکە دڵی دەوەستێت.

بە دەنگێکی پچڕ پچڕ دەستی کرد بە قسەکردن:

– ببوورە، من تەلەفۆنم بۆ خالید ئێرتوغروڵ کردبوو.

منیش بۆ ئەوەی کەمێك بێتەوە سەر خۆی وتم:

– کام خالید ئێرتوغروڵ؟

– خالید ئێرتوغروڵی نووسەر، ئـەوەی ڕۆمانـەکانی محمـدی دوزجـەیی و ئایسێلی نووسیوە.

– فەرموون من خالید ئێرتوغروڵم.

هەر ئەوەندەم وت، بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو وتی:

– ئەوە ئێوەن مامۆستا، بڕوا بکە ئێستا خەریکە دڵم دەوەستێت.

– بەڵێ دیـارە، بـەڵام پێویسـت بـەوە ناکـات، چـونکە منـیش مرۆڤێکـی ئاساییم، تاکە جیاوازیمان ئەوەیە من نووسەرم و ئێوە خوێنەر.

پێش ئەوەی باسی خۆی بکات هەندێك پرسیارم لیٚ کرد بۆ ئـەوەی بێتـەوە سەر خۆی، کە هەستم کرد خۆی کۆکردوەتەوە ئەوکات وتم:

– ئێستا فەرموون، گوێم لێتانە.

ئەویش بەم شێوەیە دەستی پێکرد:

– ئای خوا لە تۆ ڕازی بێت مامۆستا گیان، خـەریك بـوو دەبووراٮـەوە و دەکەوتم. باش بوو کەمێك هاتمەوە سەر خۆم.

ماوەیەکی کەمە بەبەرهەمەکانت ئاشنا بووم. بەڕاسـتی "ئـەو پیـاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت" و " محمدی دوزجەیی" و "ئایسـێل" زۆر کاریـان تێکردم. بڕوا بکە بەهۆی ئەوانەوە هێشتا لەسەر خۆم نیم.

لەڕاستیدا نموونـەی ئـەو ڕووداوانـەو بگـرە خـراپتریش بەسـەر خۆمـدا هـاتوون. بۆیـە کاتێـك دەیانخوێنمـەوە کـارم تێدەکـەن، هـەر دەڵێـی لـەو کتێبانەدا باست لە ژیانی من کـردووە، لـە هـەموو ڕسـتەیەکدا ژیـانی خـۆم دەبینمەوە.

ئەو خانمە نەیتوانی لەوە زیاتر خۆی بگرێت و دەستی کرد بە گریـان، هەم دەگریا و هەم باسی ژیانی خۆی دەکرد، ئەو دەیوت و منـیش خـەریك بوو جەرگم لەت دەبوو. ئای خوایەگیان ئـەوە چ ژیانێـك بـوو! مـن توانـای گوێگرتنم نەبوو چ جای ئـەوەی ئـەو ڕووداوانـەم بەسـەردا بێـت! تەنانـەت بیرکردنـەوەش لـەو ڕووداوانـە دەیخسـتمە لـەرزین و، دونیـای لەبەرچـاوم سەرەو ژێر دەکرد.

بەردەوام بوو لە قسەکردن و وتی:

– که کتێبەکانتم خوێندەوە، بیرم کەوتەوە هەندێك پەیامی گرنگم هەیە پێویستە بە مرۆڤەکان و بەتایبەتی بە گەنجەکانی بگەیەنم، بۆ ئەوەی ئەوانیش سوود لە ئەزموون و ژیانی پڕ ئازارو مەینەتیم وەربگرن.

پێویستە بەسەرهاتی ژیانی خۆمت بۆ باس بکەم و بە نهێنی نەمێنێتەوە، تا چیتر ڕۆژانە هەزاران کەسی پاك نەکەونە هەمان داوەوە.

من بە موعجیزە لەدەستی ئەو ستەمکارانە ڕزگارم بوو کە بازرگانی بە ناموسی خەڵکەوە دەکەن، لەوانەیە ئەوانەی دەکەونە ئەو داوەوە هێندەی من بەختی ڕزگاربوونیان نەبێت، دەمەوێت باسی هەموو ئەو داوانە بکەم کە تێیان کەوتم، تاوەکو ئەگەر کەمێکیش بێت یارمەتی گەنجەکان بدەم.

مامۆستا، پێویستە شتێك بکەم، من لەناو زەلکاوی ئەو تاوانە نەفرەتیانەدا جوانیم لەدەست چوو. دەمەوێت ببێت بە وانەیەك بۆ ئەوانەی ئارەزووی دنیا پەتی خستوەتە ملیان و هەڵی خەڵەتاندوون، با کەسی تر ئەو ئازارانە نەچێژێت.

ئەم خانمە بە ئاهی هەڵەکانی ڕابردوویەوە دەسووتا، بەسەرهاتی ئەم خانمە کە لەنێو ئازاردا دەتلایەوە زۆر کاری تێکردم. دوایین جار وتی:

– مامۆستا، بۆ ئەوەی هەموو ژیانمتان بۆ باس بکەم بانگهێشتتان دەکەم، ناونیشانەکەت دەدەمێ، چاوەڕێم بەزووترین کات سەردانمان بکەیت، تکایە چاوەڕێتین.

بۆ نووسەرێك لەم هەواڵە خۆشتر دەبێ چی بێت؟ بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدەم بەڕێ کەوتم.

دوای یەکترناسینێکی کورت، ئەم خانمە بەڕێزە بە جوانی خۆی باجی هەڵەکانی دابوو، دەستی کرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی.

ئای خوایەگیان ئەم خوشکەمان چی کردووە، زنجیرە ڕووداوێك بوو جەرگی لەت لەت دەکرد، وامدەزانی من گوێگرێك نیم بەڵکو بەشێکم لە ڕووداوەکان.

لەبەرامبەر ئەو ڕووداوانەی (سێڤدا) خان باسی دەکردن وەك سەهۆڵ بەستبووم، هەموو ئەوانەش کە گوێیان گرتبوو ئاگایان لە خۆیان نەمابوو، ئەو ڕووداوە پڕ پەند و ترسناکانە پەیامی زۆر گرنگیان بە هەموو کۆمەڵ دەدا.

ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەم یادەوەرییە تاڵانە بخوێنینەوە، دەوروبەریش هانبدەین بیخوێننەوە، ئەگەر نا ئەم بەڵایانە لە نزیکترین کاتدا لە دەرگای ئێمەش دەدەن، کاتێك لەو ماڵە دەرچووم هێشتا فرمێسکەکانم وشك نەبووبوونەوە...

لە بەرامبەر ئەم بەسەرهاتەدا من جەرگم دەسووتا و ناخم دەهەژا و دڵم پارچە پارچە دەبوو، بە دڵنیاییەوە ئێوەش خۆتان لەنێو ئەم لاپەڕانەدا ون دەکەن.

# بەشی یەکەم



دەڵێن: "هەرشتێك چۆن دەست پێ بكات هەروا بەردەوام دەبێت" خوا بمان پارێزێت! ئەگەر ئەم وتەیە وابێت، من كەسێكم پێش ئەوەی دەستم پێ كردبێت دۆڕاندوومە. بەداخەوە وا دەردەكەوێت ئەم وتەیە بۆ من ڕاست دەرچووبێت..



# که چاوم کردەوە یەکەم شتێك بینیم
# گریانی دایکم بوو



## هەر لەدایك بووم ڕووبەڕووی مردن بوومەوە

هەموو ژیانێك چیرۆك و بەسەرهاتی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی بەسەر مندا هات نە چیرۆك دەیگرێتە خۆی نە ئەفسانە.

نازانم چۆن ژیانێکی ئاوام بردۆتەسەر؟ چۆن توانیم لەناو ئەو هەموو ئازارەدا بە ساغی دەربچم؟ بەڕاستی کۆمەڵە ڕووداوێکن لە سنووری لۆژیك دەرچوون و عەقڵ لە ئاستیاندا دەوەستێت...

کەسێك خوا نەیمرێنێت نامرێت، لەوانەیە خوای گەورە منی بۆ ئەوە هێشتبێتەوە ببمە دەرس بۆ ئەوانەی دوای خۆم تا ئەوانیش نەکەونە ناو هەمان هەڵەوە.

دەردەسەرییەکانی ژیانم لە لەدایکبوونمەوە دەستیان پێکرد.

دایکی داماوم لەبەر ئەوەی باوکم زۆری لێدابوو تووشی خوێن بەربوونێکی قورس بووبوو بۆیە من بە حەوت مانگی لەدایك بووم.

قسەی هەموو دەورووبەرم ئەمە بوو: "ئەم ئافرەتە ، هەم خۆی هەم منداڵەکەی دەمرن، ئاخر کێ بەرگەی ئەو هەموو خوێن بەربوونە دەگرێت؟

خۆ منداڵەکەش بە ناتەواوی لەدایك دەبێت، ئەویش دوای چەند ڕۆژێك دەڕوات." جا ئەو کاتە کوا دکتۆر هەیە؟ با هەشبێت کەس نییە ببیات بۆ لای دکتۆر...

باوکم مەیخۆرێکی سەیر بوو، هەموو ژیانی ئەو بریتی بوو لە خواردنەوە و پارە پەیدا کردن بۆ خواردنەوە. کەسێك بوو ئامادە بوو هەموو شتێك بکاتە قوربانی خواردنەوە، لەبەرئەوە هیچ گوێی بەمن و دایکم نەدەدا.

ئەو بێویژدانە، لەبەرئەوەی نەیتوانیبوو ئەو پارەیەی خێزانەکەی نانی پێ دەکڕێت لێی بسەنێت، ئەو ئافرەتە داماوەی دابووە بەر شەق و زللە، ئەوە لەکاتێکدا کە سکەکەی حەوت مانگ بووە.

بۆیە هیچ قورس نییە پێشبینی ئەوە بکرێت کە چی بەسەر منداڵێکی ناتەواوی وەك مندا دێت، لەکاتێکدا کچی باوکێکی ئاوا خراپ و دایکێکی ئاوا بەدبەخت بم کە ناچاربووە بە چارەنووسی خۆی ڕازی بێت. ئەی ئاشکرا نییە کە داوەکانی ژیان بۆ ئەو کەسانەیە کە بێکەس و بێسەرپەرشتن، ئەوانەی بەسەر منیشدا دەهاتن هەر لەبەر ئەمە بوو...

ئاە دایکە بێچارەکەم، چەند ڕۆژ بەدەست خوێن بەربوون و ئازارەوە نالاندوتە، باوکم کە دەهاتەوە هەر نەیدەوت: "ئەرێ حاڵتان چۆنە؟". دراوسێ خێرخوازەکانمان سەلامەت بن هەر ئەوان دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکردین، بەتایبەتی پوورە هاجەر...

## دایکم وەك جەنازە وابوو

بەڕاستی خوای گەورە پوورە هاجەری بۆ ئێمە ناردبوو، کردبووی بە دراوسێی ئێمە. ئەو نەبوایە نازانم حاڵمان چۆن دەبوو!

دایکم ڕزگاری بوو بەڵام چۆن ڕزگاربوونێك؟ بەدرێژایی ژیانی بەدەست کەم خوێنی و نەخۆشی گورچیلەو تەنگەنەفەسییەوە دەیناڵاند، هەموو ئەو نەخۆشیانەش یادگاری ئەو ڕۆژانەن. ئەگەر بێمە سەر باسی ژیانی خۆیشم، ئەوا چەندین جار لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوودەبوومەوە، دایکم لە ترسی مردنی من چەندین ڕۆژ فرمێسکی ڕشتووە.

دوای ئەوەی کەمێك پێگەیشتم دیمەنی ئەو خێزانەی لەبەرچاوم بوو زۆر ترسناك بوو: باوکێکم هەبوو چەند ڕۆژ جارێك بەسەرخۆشی خۆی دەکرد بە ماڵدا. بۆیە دەڵێم چەند ڕۆژ جارێك، چونکە زۆر جار هەر لەو جێیەی دەیخواردەوە دەمایەوە، کە دەشهاتەوە ماڵەوە قیامەتی بەرپادەکرد. من و دایکمی دەخستە ڕیزەوە بۆ تێهەڵدان، داوای شتی مەحاڵی دەکرد، کە نەماندەتوانی بۆی بکەین، عەقڵی لەدەست دەداو دەبووە تۆپێك لە ئاگر، هەر لەبەر ئەوەش بوو حەزمان نەدەکرد بێتەوە بۆ ماڵەوە. دەمانزانی ئەگەر بێتەوە چی ڕوو دەدات، یان ئەوە بوو دایکمی دەدایە بەر شەق و زللە، یان منی دەکێشا بەم دیوار و بەو دیواردا، دواتریش بێبەزەییانە جێی دەهێشتین.

لە جیهانی منداڵیمدا ئەوەندە دەترسام بیوەستان لەخوا دەپاڕامەوە: "خوایەگیان باوکم بمرێنە با ڕزگارمان بێت."

بیر بکەنەوە، کچێکی تەمەن پێنج ساڵ کە کاتی وابەستەبوونە بە باوکەوە، نزای شەڕ لە باوکی بکات و بڵێت: "خۆزگە بمردایە و ڕزگارمان بوایە."

دایکیشم خەریك بوو لەناو ئازارەکانیدا نغرۆدەبوو، وەك ئەوەی نەخۆشییەکەی خۆی بەس نەبێت، ئەو حاڵەی باوکم لەلایەك و لەلایەکی دیکەیشەوە داواکارییەکانی براکەم تەواو نەدەبوو. ئای خوایەگیان، چۆن دەتوانێت ئەو بارە قورسە هەڵبگرێت! دایکی بێچارەم ڕۆژ بە ڕۆژ تەندروستی خراپتر دەبوو، سەرباری ئەوەش بۆ ژیان تێدەکۆشا.

ئای دایەگیان! تۆ چ ڕۆژانێکت بەسەربرد...؟

دایکی ستەم دیدەم کەم خوێنی و، نەبوونی دەرمان و، ڕەنگە زەردە پەڕیوەکەی و، تەنگەنەفەسییەکەی ئەو هەستەی بۆ دروست دەکردین کە بڵێین وا دەخنکێت. لەبەر ئازاری گورچیلەشی حاڵی تەواو تێکچووبوو.

دەردەواری و هەناسەساردی دایکم تەنیا ئەوانە نەبوو بەڵکو خەمی پێداویستیماڵیشی لەسەربوو. لە خانوویەکی کرێدا بووین، پێویست بوو هەموو ڕۆژێك خواردن لێبنرێت و پێداویستییەکانی ڕۆژانەش ئامادە بکرێن.

ئەی پارە کوا؟

باوکم لەجێی ئەوەی پارەی نانێکمان بۆ پەیدابکات، ئەوەی لە دەستیشماندا بوو دەیبرد و دەڕۆیشت. دایکیشم کە نەیدەتوانی پارە پەیدا بکات، دەچوو لە لای دراوسێکەمان ئاردی دەهێنا دەیکرد بە نان و سکی ئێمەی پێ تێر دەکرد. لەو ساڵانەدا هیچ دەرامەتمان نەبوو، بەڵام ئەوە هەبوو دایکم دروومانی باش دەزانی، دراوسێکانیش لەبەر یارمەتیدانی،

هەندێك شتی بچووكیان دەهێناو پێیان دەدووری، بەڵام دایكم ئەوەندە حاڵی خراپ بوو كە نەیدەتوانی ئەوەش بكات.

ئەندامێكی دیكەی خێزانەكەمان، برا گەورەكەم بوو كە دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو. ئەو كەسێكی زۆر ژیر بوو، پێگەیشتووییەكەی لەئاست تەمەنیدا نەبوو، پورە هاجەریش زۆر خۆشی دەویست.

هەموو جارێك دەیوت: "ئەم كوڕە پیاوێكی زۆر گەورەی لێ دەردەچێت، بەڵام ئەم كچە مەگەر بەس خودا بزانێت سەری كێ دەخوات!"

## ڕابردووی خێزانەكەم

باوكی دایكم لە یوگسلافیاوە هاتووە و لە توركیا نیشتەجێبووە. لەچوار خوشك و برا دایكم بچووكترینیان بووە و خوشك و براكانی دیكەی زوو ماڵئاواییان لە ژیان كردووە. بەڕاستی مردنی هەر یەكێكیان خۆی بۆ خۆی تراژیدیایەك بووە. نەنكم و باپیرم لە دوای ئەوانەوە وەفاتیان كردووە. كەواتە دایكم كۆتا كەسی ئەو ڕەچەڵەكە بووە، هەرلەبەر ئەوە بوو هیچ كەسی نەبووتا دەردی خۆی بۆ باس بكات و لای بمێنێتەوە.

باوكیشم خەڵكی ئیزمیر بوو، باڵابەرزو قۆز و قژ زەرد بوو، هەر ئەوەیش بوو بوو بە بەڵا بەسەرییەوە، لەبەر ئەوە بوو خواردنەوەو ئافرەت و قومار ژیانی بوون.

دایكم، كە زۆر تووڕە دەبوو لە باوكم پێی دەوت: **"شێتی یۆنانی"**. جا نازانم لە تووڕەییدا وای دەوت یان شتێك هەبوو دەربارەی باوكم

دەیزانی. ئەوەندە دەزانم ئـەو کەسێکی زۆر شـپرزە و بێهەسـت و سۆز و بەزەیی بوو، هیچ ترسی خودای لەدڵدا نەبوو.

لای ئـــەو پیرۆزییـــەکانی وەك ئـــایین و بیروبـــاوەڕو ڕەوشـــت هـــیچ مانایـــەکیان نـــەبوو، هەسـتی بـۆ داب و نـەریت و بـەهاکان نـەبوو، ئـەوە خستبوومیە گومانەوە بەرامبەر بە باوکم کە چۆن مرۆڤ ئەوەنـدە لـە داب و نەریتێك دادەبڕێت کە لەناو کۆمەڵگادا هەبووبێت و پێوەی گـرێ نـەدرابێت و، بگاتە ئەو ڕادەیەی ئاوا بێویژدانانە لەگەڵ خێزانەکەیدا مامەڵە بکات.

ئەو دایکەم کە لە کچێنیدا زۆر جوان بووە، بەهۆی نەخۆشـیەکانییەوە چۆکی داداوەو ڕەنگی مردووی لێنیشتووە.

## یارمەتییەکانی پوورە هاجەر

ئەو هەموو ناڕەحـەتی و ناخۆشـی و بێچـارەییەی لـەماڵی ئێمـەدا بـوو ئەگەر کەمێکیش بێت پوورە هاجەر لەسەری لا دەبردین.

پوورە هاجەر وەك فریشتە وابوو، وەك ئەوەی ئێمـە منـداڵی ئـەو بـین باڵی بۆ کردبووینەوە دەیویست ببێتە دەرمان بۆ دەردەکانمان. ئـەو تاکـە سەرچاوەی ورەی دایکم و تاکە پشتیوان و جێی ڕازی دایکم بوو. بەردەوام دڵی دایکمی دەدایەوە، پێویستیەکانمانی دابین دەکرد و دەرمـانی دەهێنـا و دڵـی دەدایـنـەوە. جگـە لـەوەی هـەموو مانگێـك بـەناوی ئـەوەی لـەملا و ئەولاوە هاتووە، بڕێك پارەی دەداینێ.

لە یادەوەری ئەو ڕۆژانەدا قسەکانی پوورە هاجەرم هـەر لـەبیرە، کـە دەهاتـە ماڵمـان ئێمـەی لـە دەوری خـۆی کـۆدەکردەوە و وانـەی بـاوەڕ و قورئـــانی پـــێ دەوتـــین، باســـی پێغەمبەرەکـــەمان ﷺ و ڕۆژی دوایـــی و

بەندایەتی خوای گەورەی بۆ دەکردین. ئەوەندە چیرۆکی ئاینی خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە هەمووماں حەزمان لە گوێگرتنی بوو. نوێژ و پەرستش لەوەوە فێربووین. هەموو نزاکانی پێ لەبەرکردبووین، جگە لەوەش کوڕەزایەکی لەتەمەنی مندا هەبوو، کە دەهات ئەویشی دەهێنا، لەگەڵ ئەو یاریم دەکرد، باشترین هاوڕێم بوو.

پوورە هاجەر بەردەوام (پەیامی بیماران)ی بۆ دایکم دەخوێندەوە و هەوڵی دەدا لەبەر ئەو ناڕەحەتی و ناخۆشیانەی تووشی دایکم بووبوو دڵی بداتەوە، وەك گەورەی ماڵەکەی لێ هاتبوو. جار بە جار ئەو چاودێری کارەکانمانی دەکرد، جا بەدڵنیاییەوە ئەوە گەورەترین لوتفی خوا بوو بەسەر ئێمەوە. ئەگەر ئەو نەبووایە هەرگیز نەدەگەیشتینە ئەم کاتە، بەتایبەتی دایکم کە بەبێ ئەو نەدەژیا.

ڕەنگ و ڕووی پوورە هاجەر وەك دڵی پاك و بێگەرد بوو. وەك ئەوەی سۆز و بەزەییەکەی لە دڵ و دەروونیدا ڕەنگی دابێتەوە.

تاکە کەسێك کە باوکم شەرمی لێ دەکرد ئەو بوو، کە دەهاتەوە ماڵەوە بیبینیایە پوورە هاجەر لەوێیە نەدەهاتە ژوورەوە، یەکسەر دەڕۆیشت.

ساڵانی تەمەنمان لەنێو ناخۆشی و نەهامەتیەکی وادا بەسەر برد کە بەرگەگرتنی زۆر ئەستەم بوو. لەگەڵ براکەمدا لەنێو بێچارەیی و نەبوونی پێداویستیدا لەسەر خوێندن بەردەوام بووین. دایکیشم بۆ پەیداکردنی پارەی دەرمان و خواردن و کرێیی خانوو هەر ئەمسەر و ئەوسەری بوو.

## هەواڵی یەکەم بەڵامان پێگەیشت

سەریاری ئەوەی باوکم عارەق خۆر بوو و کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئازاریشی دەداین، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەو باوك بوو. ڕاست بوو زۆریش نەدەهاتەوە ماڵەوە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە لەڕووی دەرەوەدا وەك گەورە و پارێزەرێك بوو بۆ ئێمە.

دە ڕۆژ بوو هیچ هەواڵێکمان لە باوکم نەبوو، دایکیشم زۆر شڵەژابوو. دەستی کردبوو بە گەڕان بە ڕاست و چەپدا و دەیوت: "هەرگیز بۆ ماوەیەکی ئەوەندە درێژ لە دەرەوە نەماوەتەوە. باشە بڵێی چی بەسەر ئەم پیاوەدا هاتبێت؟" لە هەموو ناسراوەکانمان پرسی، چووینە هەموو ئەو شوێنانەی بۆی دەچوو، بەڵام باوکم دیار نەبوو.

دایکی داماویشم دەستی کردبووە فرمێسك ڕشتن بۆ ئەو پیاوەی هەموو ژیانی لێ کردبووە دۆزەخ و، نەخۆشی خستبوو و لە ناو ئەو هەموو کێشەیەدا بەجێی هێشتبوو.

دیارنەبوو... لەهیچ جێیەك نەماندۆزییەوە... نەمانتوانی لە هیچ جێیەکەوە شوێن پێی بدۆزینەوە. لەهەرکەسمان بپرسیایە دەیوت: "ئێمەیش پازدە بیست ڕۆژێکە نەمان دیوە."

لە ئەنجامدا خراپی و ناپاکی باوکمیان قوت دا. ئەو ڕێگا هەڵەیەو، ئەو مرۆڤە خراپانەی دەوروبەری وەك چۆن هەزاران مرۆڤیان لەناوبرد، باوکیشمیان بە گەنجی برد. تا ئێستاش هیچ هەواڵێکمان لەبارەیەوە بەدەست نەگەیشتووە.

ئێمە پێمان وایە گوولەیەکی وێڵی بەر کەوتووە و لە شوێنێك فڕێیان داوە، هەرلەبەر ئەوەیە کە دوای ئەم هەموو ساڵە هیچ هەواڵێکمان لێی نییە، لەوانەیە باوکم بەهۆی ئەو ئیشە خراپانەوە کە دەیکردن ئازاری بە زۆر کەس گەیاندبێت و دوعای خراپی زۆر لێکرابێت هەر بۆیە لەو ڕێیەدا فەوتا. وەك دەڵێن: " گۆزەی ئاو لەڕێی کانیدا دەشکێ" یا "چی بچێنیت ئەوە دەدووریتەوە".

## پوورە هاجەر ئێمەی کۆکردەوە

من لە دوایین ساڵی قۆناغی ناوەندی دەمخوێند، برا گەورەکەشم لە قۆناغی دووی ئامادەیی بوو. ئیتر کوڕەگەورەی ماڵەکەمان براکەم بوو. هەم کاری دەکرد و هەم دەیخوێند. هەموو پێداویستییەکانمانی دابین دەکرد، بۆ چاکبوونەوەی دایکیشم زۆر بە پەرۆش بوو. زۆر ژیر و سەر ڕاست بوو. خاوەنی کەسایەتییەکی باش بوو، دەیزانی چۆن هەڵسوکەوت دەکات.

بەدڵنیاییشەوە پوورە هاجەر نەبووایە نەماندەزانی چی بکەین. خوای گەورە بۆ هەتاهەتایە لە پوورە هاجەر ڕازی بێت... هەم دایك بوو بۆمان هەم باوك، دایکم بەدەم دوعای خێرەوە دەیوت: "لە خوای گەورە بەزیاد بێت، لەجێی باوکتان ئەمی بۆ ناردووین".

لەدوای مردنی باوکم ئەوەندە گوزەرانمان خراپ بوو بوو کە نەدەمانتوانی کرێی خانووەکە بدەین نە پێداویستیەکانیشمان دەست بخەین. وامان لێهاتبوو بۆ پارچە نانێك لێمان قەومابوو. پوورە هاجەریش ئێمەی بردە ژێرزەمینی ماڵەکەی خۆیان. کە لە ژوورێك و چێشتخانەیەك

پێکهاتبوو، بەڵام لەبەر خێر کرێی لێ وەرنەدەگرتین، لەسەروو ئەوەشەوە هەرچی هەبوایە لەگەڵی بەش دەکردین.

ئافرەتێکی دەوڵەمەندی تەمەن پەنجاساڵ بوو، ماڵەکەیان سێ قات بوو. لە قاتی یەکەمدا خۆی و مێردەکەی (ڕەحمی) دەژیان، لە قاتی دووەمیش کچەکەی –خاتوو (نوور)ی کچی دەژیا– ئەویش کچێکی هەبوو لەتەمەنی مندا بەناوی شەیدا، کە باشترین هاوڕێی من بوو.

لەلایەکەوە هەوڵەکانی براکەم و لەلایەکەوە یارمەتییەکانی پوورە هاجەر، ئیتر وردە وردە خەریك بوو دەهاتینەوە سەر خۆمان.

## ئەمەیان زۆر ترسناك بوو

بەداخەوە هەواڵمان لەو بەڵایە نەبوو کە چاوەڕێمان بوو. قوتابخانەی من و براگەورەکەم یەك حەوشەیان هەبوو، بەیانیان لەگەڵ ئەودا بەیەکەوە دەڕۆیشتین و ئێواران بەیەکەوە دەهاتینەوە. براکەم زۆر غیرەی لەدڵدا بوو، لەبەر ئەوەی خۆیشی زۆر حەزی لە هاوڕێیەتی کچ و کوڕ نەدەکرد، ئیتر زۆر بە وردی چاودێری دەکردم. ڕێی نەدەدام بچووکترین هەڵە بکەم.

زۆر سوودی لە قسەکانی پوورە هاجەر وەرگرتبوو بۆیە گەنجێکی زۆر دیندار دەرچووبوو. بەڕاستی من وەك ئەو لە ئایینەوە نزیك نەبووم. گەورەترین کەیفی من لە جل و بەرگ و خۆڕازاندنەوەدا بوو، چونکە دەمویست خۆم لە بەرامبەر دەوروبەردا بسەلمێنم. ئەوە بووە هۆی ئەوەی زوو زوو لەگەڵ براکەمدا دەنگمان بێت. هەموو جارێك دایکم جیای دەکردینەوەو دەیوت: "کوڕم ئەم کچە هێشتا منداڵە، زۆری لێ مەکە. کە

گەورە بوو خۆی لە قسەكانت تێدەگات." بەم شێوەیە هەم منی دەپاراست و هەم هەوڵی دەدا براكەم ڕازی بكات.

لە پشووی نیوەڕواندا نەماندەتوانی بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە، چونكە ماڵەكەمان دووربوو، بۆیە لە فرۆشتگای قوتابخانەكەدا لەگەڵ براكەمدا یەكترمان دەبینی و لەو خواردنانەی دایكم بۆی ئامادەكردبووین دەمانخوارد و خۆمان تێر دەكرد.

وەكو هەموو جارێك چووم بۆ فرۆشتگاكە و مێزێكم هەڵبژاردو چاوەڕوانی براكەم دەكرد، خەریك بوو پشووی نیوەڕوان تەواو دەبوو كەچی هێشتا براكەم دیار نەبوو. چوومە دەرەوە وتم: با پرسیارێك لەوانە بكەم كە براكەم دەناسن.

مامۆستای زانستمان منی بینی، لەبەرئەوەی ماڵی لەنزیك ماڵمانەوە بوو هەم براكەم و هەم منی باش دەناسی، بانگی كردم و پرسی:

- براگەورەكەت چی لێهات كچم، هیچ هەواڵتان لێی هەیە؟

لەو كاتەدا وامزانی پیكێك دای بە سەرمدا، ناخم خەریك بوو گڕی دەگرت.

- بۆچی مامۆستا براكەم چی لێهاتووە؟

مامۆستاش كە زانی هەواڵم لە هیچ شتێك نییە، بەشێوەیەكی زۆر سادە وەڵامی دامەوە:

- نا نا هیچی نییە. وابزانم لە پۆلدا سەری گێژی خواردووە. مامۆستاش وتویەتی با بتبەمە لای دكتۆر، لەبەرئەوە تا نەخۆشخانە چوون، مەترسە ئێستا دێنەوە.

خەنجەرێکی وا دابووی لە دڵم کە لە هەموو هەناسەیەکمدا هەستم بە ئازارەکەی دەکرد. عەقڵم وەستابوو، نەمدەزانی چی بکەم. وەکو شێت بەدەوری خۆمدا دەسووڕامەوە. نەخۆشخانە زۆر دووربوو. نە دەمتوانی بە پێ بڕۆم و نە پارەی تەکسیشم پێ بوو، بۆیە تکام لە مامۆستاکەم کرد:

– تکا دەکەم مامۆستا، من ناتوانم لێرە ئاوا چاوەڕێ بم، دەتوانیت بمبەیت بۆ نەخۆشخانە؟

– ئەی چۆن کچم، بەدڵنیاییەوە دەتبەم. ئەگەرچی شتێکی نییە تا بترسیت، بەڵام مادام حەزدەکەیت بەچاوی خۆت ببینیت وەرە با بڕۆین.

## لەوێدا لەهۆش خۆم چووبووم

بیرم نایەت چۆن گەیشتینە نەخۆشخانە. کە چووینە نەخۆشخانەی فریاکەوتن چی ببینم باشە؟ ئەو مامۆستایەی براکەمی هێناوە بۆ نەخۆشخانە، لە بەردەم دەرگای نەخۆشخانەکەدا خەریکە لە خەفەتدا دەمرێت، هەر ئەمبەر و ئەوبەرێتی. هەر کە منی بینی، نەیتوانی هیچ بشارێتەوە. خێرا باوەشی پێدا کردم.

– کچم، نەمانتوانی ڕزگاری بکەین، ئەو کوڕە فریشتەئاسایەمان گیانی سپارد، ئەو گەیشت بەو خوایەی کە زۆری خۆشدەویست.

وامزانی بڵێسەیەکی ئاگر لە سەرمەوە ڕۆیشت و هەموو گیانی سوتاندم، هەر لەوێدا کەوتم.

ئاخر چۆن بەرگەی ئەم ئازارە بگرم؟ ئیتر لەمە بەدواوە کێ دڵم بداتەوە؟ کێ دەستم بگرێت؟ کێ وەکو چاوی خۆی بمپارێزێت؟

کوڕە گەورەی ماڵەکەمان لەدەست دا. ئەو هەموو کەسێکمان بوو.

یەکەمجار باوکم، دواتر برا گەورەکەم... ژیان چەندە بێبەزەیی بوو بەرامبەرمان، چارەنووسمان چەند خراپ بوو... دواتر زانیمان براکەم هەر لە منداڵیەوە دڵی نەخۆش بووە و نەمان زانیوە. ئەو بەڵا خراپە بێئەوەی هەواڵمان بداتێ براکەمی بەرەو مەرگ پەلکێش کرد تا وای لێ هاتبوو لە کاتی وانەدا کەوت و هەڵنەستایەوە.

ئەی دایکم؟ بەڕاستی هیچ کەس بەرگەی ئەو هاوار و داد و گریانەی دایکمی نەدەگرت. ئەو تاکە ئومێدی خۆی لەدەست دابوو، وەك ئەوە وابوو کە ماڵەکە دارمێت بەسەریدا و ئەو دیوارەی پاڵی پێوە داوە بڕوخێت... چەندین ڕۆژ و بگرە چەندین مانگ نەهاتەوە سەر خۆی. ئەگەر پوورە هاجەر نەبووایە نەیدەتوانی بۆ یەك ڕۆژیش هەستێتەوە.

# بەشی دووەم



بەرگەگرتنی ئەو هەموو ئازارە ئەستەم بوو. ئێمە نەدەژیاین بەڵکو لە گیان دەرچووندا بووین. پێدەچێت بەم ژیانە بوترێت "دۆزەخی ئەم جیهانە"

بە بەردەوامی هاوارم لە خوا دەکرد:

"خوایەگیان! یان ڕزگارمان بکە یان بمانمرێنە!"



# دایك و كچ بە تەنیا مابووینەوە، تاكە دۆستمان پوورە هاجەر بوو



## میوانێكی ئەفسوناوی

كە تاكە ئومێدی خۆمان لەدەستدا، دایك و كچێكی عازەب بە تەنیا مابووینەوە. نە من و نە دایكم توانای گوزەراندنی ژیانێكی ئاوامان نەبوو. لەو ژیانە ناهەموارەدا، بێ ئەوەی ئاگامان لە تەڵە و بەربەستەكانی بەردەممان بێت، دەفتەری ژیانمان پڕ دەكردەوە.

كە چوومە قۆناغی ئامادەیی خۆم بە كچێكی عازەب دەزانی و هەموو شتێكم دەكرد بۆ ئەوەی لای دەوروبەر خۆم دەربخەم. ئاگام لەوە نەبوو كە ئەو هەڵسوكەوتانەم ڕووبەڕووی هەموو جۆرە مەترسییەكم دەكەنەوە.

گوایە لەبەرئەوەی كە بێبەش بووم لە هەموو شتێك، ئیتر بەو شێوەیە خۆم دەسەلماند. ئەو ڕێیەم بۆیە هەڵبـژاردبوو چونكە نەمدەویست لەناو هاوڕێكانمدا و بەتایبەت دەوڵەمەندەكاندا هەست بە كەمی بكەم. بەڵام بێئاگا بووم لەوەی ئەو ڕێگە هەڵەیە چەندین بەڵا و وەیشومەی تێدایە. بێگومان ژیانی سەرەڕۆیی پڕە لە هەڵدێرو نشێو.

دایکم و پووره هاجەریش کە دەیانبینی لەسەر ڕێیەکی هەڵەم، زوو زوو ئاگاداریان دەکردمەوە کە ڕێکوپێك هەڵسوکەوت بکەم و زیاتر ئاگاداری دەوروبەرم بم، بەڵام من زۆر گرنگیم بەو قسانە نەدەدا خەیاڵە ڕەنگاڵەییەکانی کچێنی و حەزەکانم، هۆش و بیریان بردبووم. ئەوەش وای لێ کردبووم هەڵە لەدوای هەڵە دووبارەبکەمەوە.

ئاخ کاکەگیان ئاخ! تۆ بمایتایە، ئەو هەموو بەڵاو ناڕەحەتیانەمان بەسەردا نەدەهات، تۆ بمایتایە ئەو گورگانەی ژیانیان تاریك کردم، نەیانـدەتوانی دەستم بۆ ببەن. نەبوونی تۆ ئەو هەموو خراپەو، ناڕەحەتییەی هێنایە پێشمان.

من لەناو خەیاڵ و حەزەکاندا ئەمسەر و ئەوسەرم دەکرد تا ڕۆژێکی یەکشەممە میوانێکی سەیر هاتە ماڵمان.

تازە لەخەو هەستابووم. ئەو شەوە دایکم تا بەیانی ناڵاندی، خەو نەچووبووە چاوی. یەکێك لەدەرگای دا، کە دەرگاکەم کردەوە بینیم ئافرەتێکی بەتەمەنە. زۆر شیرین و نوورانیی بوو، وەك ئەوەی چاوبەستی لێ کردبم یەکسەر حەیرانی بووم.

– سەلامو عەلەیك کچم، بەیانیت باش

– عەلەیکە سەلام پوورێ فەرموو. کە ئەمەم وت هاتمە دواوە.

– کچم زۆر تینوومە، دەتوانیت پەرداخێك ئاوم بدەیتێ؟

– بەسەرچاو، ئەوە چ قسەیەکە ئەی چۆن ناتدەمێ.

بۆ ماوەیەك وامزانی خزمەتکارێکم لەژێر فەرمانی ئەودا، چونکە یەکسەر کاری تیّ کرد. یەکسەر بەرەو چێشتخانە ڕامکرد، کە خەریکی ئاوتێکردن بووم دایکم هاواری لێکردم:

– ئەوە کێیە کچم؟

– ئافرەتێکی بەتەمەنە، تینوویەتی داوای ئاو دەکات.

– بەم بەیانییە؟

– بەڵیّ بەم بەیانییە.

بەڕاستی منیش پێم سەیر بوو بەو بەیانیە کەسێکی ئاوا بێت.

دایکم هاواری لیّ کردم:

– دەی بیهێنە ژوورەوە بۆچی لەبەردەرگا ڕایدەگریت.

پەرداخەکەی دەستم دانا و ڕۆیشتم ئەو ئافرەتە بهێنمە ژوورەوە کە سەرنجمی بەرەو لای خۆی ڕاکێشابوو.

– پووریّ، بۆ نایەیتە ژوورەوە کەمێك بحەسێیتەوە، منیش ئاوەکەت بۆ دەهێنم.

کەمێك سەیری کردم و وتی:

– با نەبمە مایەی زەحمەت بۆتان.

– زەحمەتی چی پووریّ، فەرموون.

ماڵەکەمان تەنیا یەك ژووری هەبوو، بردمە ئەویّ. سەلامی کرد و چوو لای دایکم دانیشت و بەدەنگێکی پڕ بەزەییەوە بە دایکمی وت:

– خوا شیفات بدات خوشکی دوارۆژم.

دەنگی ئەوەندە زوڵاڵ و شیرین بوو باس ناکرێت.

## نیگاکانی چاوبەستی لە مرۆڤ دەکرد

دەستی دایکمی گوشی و دەستی هێنا بەسەر پشت و قۆڵیدا و وتی:

– خوای گەورە گەورەترین پاداشتی بۆ بەندە نەخۆشەکانی داناوە، بەتایبەتی ئەوانەی سوپاسگوزاری خودان و یاخی نابن و پەرستشەکانیان بەجوانی ئەنجامدەدەن. جێی ئەو نەخۆشانە لە بەهەشتدا لە لای ڕاستی پێغەمبەرەوەیە ﷺ، تەنانەت حۆرییەکانی بەهەشتیش خۆزگە بەوان دەخوازن. ئەوان لەجێی ئەم دونیا دوو سێ ڕۆژییە پڕ لە ناڕەحەتی و ئاستەنگە موژدەی بەهەشتی نەبڕاوەیان پێ دراوە. پیرۆزباییت لێ دەکەم کچم، تۆش یەکێکیت لەوان. بە پشتیوانی خودا منیش خوشکی دواڕۆژت دەبم.

وەك ئەوەی ژیانی دایکم بزانێت قسەی دەکرد. کە قسەی دەکرد وات دەزانی فریشتەیەکەو لە بەهەشتەوە موژدەی هێناوە. ئەوەندە پاك و خاوێن بوو ئەوەندە بۆنێکی خۆشی لێوە دەهات کە هەموو ئەو بۆنانەی من بەکارم دەهێنان هیچ نەبوون لە ئاستیدا.

ئاوەکەم بۆ هێنا:

– فەرموو پووریێ ئاوەکەت بخۆ.

بەزەردەخەنەیەکەوە ئاوەکەی لێ گرتم. ڕووی کردە قیبلە، لەسەر چۆك دانیشت، (بسم الله) ی کردو بەسێ جار ئاوەکەی خواردەوە. دایکیشم بەتەواوی شەیدای بووبوو. دووبارە لەجێی خۆی دانیشت و پەرداخەکەی دایە دەستم:

– وەك ئاو خاوێن و خۆشەویست بیت، بە پشتیوانی خودا وەك چۆن ئاو پیسی ڕادەماڵێت. ئاواش خوای گەورە گوناهەکانت ڕادەماڵێت. خوای گەورە کۆتاییت بەخێر بگێڕێ، خوا بتکاتە بەندەیەکی شایستە بەزاتی خۆی.

## دەتوت زۆر باش دەمانناسێت

کە دوعای بۆ دەکردم لێم نزیك دەبووەوە، وەك بڵێی هەواڵی مەترسییەکم دەداتێ. باش دەیزانی لەسەر ڕێیەکی هەڵەم بۆیە دەیویست پێش وەخت بە وتە شیرینەکانی ئاگادارم بکاتەوە.

لە توورەکەکەی دەستیدا سێ سێوی دەرهێنا. هەرسێکیانی خستە سەر دەستی ڕاستی. یەکێکیان سوور بووبوو، یەکێکیان هێشتا پێنەگەیشتبوو، ئەویتریشیان خەریك بوو دەڕزی، دەستی بۆ من درێژ کرد و وتی:

– کامیانت دەوێت هەڵیگرە کچم.

لەبەردەم ئەو ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوەدا کەوتبوومە سەرسوڕمانەوە. لەو چیرۆکە ئەفسانەییانە دەچوو کە خوێندبوومنەوە. ئەو ئافرەتە دیاربوو کە کەسێکی جیاواز بوو. کاتێك زانی دوودڵم لەوەی چی بکەم، زۆری لێ کردم کە دانەیەکیان هەڵگرم، لەو لاشەوە دایکم ئاماژەی بۆکردم دانەیەك هەڵبگرم، ئیتر دەستم بۆ سێوە سوورەکەیان برد.

لەناو دەستی ئەو دا دوو سێو مابووەوە کە یەکێکیان پێنەگەیشتبوو یەکێکیشان خەریك بوو دەڕزی. بۆیە وتی:

- ماشەڵلاّ. ئەم خاتوونەی کچمان کارە ڕاستەکەی کرد.

ئەو سێوەی هێشتا پێنەگەیشتووە، لەو مرۆڤە ئیرادە لاوازانە دەچێت کە بەبیّ ئەوەی ڕووداوەکان بە تەواوی هەڵبسەنگێنن و، سوود لە ئەزموونی گەورەکان وەربگرن، بە هەستەکانیان بڕیاری لەناکاو دەدەن. بێگومان ئەوانە پێویستییان بە پێگەیشتنە.

هەرچی سێوە ڕزیوەکەشە، لەو مرۆڤانە دەچێت کە نازانن بۆچی دەژین، باوەڕ بەوە ناکەن کە دوای مردن زیندوو دەبنەوە، حەڵاڵ و حەرام و، حەق و ناحەق نازانن و گویّ بە ناموس نادەن. ئەوانە بەرەو گەنیوی و بۆن کردن ڕۆیشتوون، بەو حاڵەیانەوە زیانیان بۆ خۆیان و دەوروبەرەکەیان هەیە.

سێوە سوور و پێگەیشتووەکەش لەو مرۆڤە دەچێت کە بە خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەوە لەگەڵ خێزان و دۆست و هاوڕێیانیدا هەڵسوکەوت دەکات و، لەکاتی بڕیارداندا پرس بەکەسانی تێگەیشتوو دەکات. وەك مرۆڤێکە کە خوای خۆی بناسێت و هەوڵ بدات کە ببێت بە بەندەیەکی شایستە . ئەم مرۆڤانە هەم لە دونیاو دوارۆژدا دڵخۆش دەبن هەم دەبنە نموونەیەکی جوان بۆ دەوروبەر.

وا دەبینم ئەم کچەشمان ڕێی پێگەیشتوویی هەڵبژارد، بە پشتیوانی خوا هەم سوودی بۆ خۆی و هەم سوودی بۆ دایکیشی دەبێت، و خوایشی بیر ناچێت و ناکەوێتە حەرامەوە و، ژیانێك دەباتەسەر کۆتاییەکەی بەهەشت بێت.

## پەیامی زۆر ناوازەی ئاڕاستە دەکردم

قسەکانی لەمێشکمدا دەزرنگانەوە، ڕوونکردنەوەکانی زۆر جوان و ناسك بوو، بەبێ ئەوەی بم شکێنێت ئامۆژگاری دەکردم و دەیویست هەڵەکانم ڕاست بکەمەوە. یەکسەر گومانێك کەوتە دڵمەوە، تۆ بڵێی بیەوێت پێم بڵێت کە کۆتاییەکی خراپم هەیە.

هەستایە سەرپێ و سوپاسی کردین و وتی:

– خوای گەورە بۆ هەتاهەتایە لێتان ڕازی بێت، لەسەر ئازارەکان ئارام بگرن و سوپاسی پەروەردگار بکەن. خوای گەورە لەگەڵ ئارامگران و سوپاسگوزاراندایە، ئەو دۆستی تەنهایانەو لەگەڵ بێکەساندایە. هەرکەس پشت بەو زاتە ببەستێت پێویستی بەکەس نییە.

دایکیشم وتی:

– تکایە دانیشن ئێمە پێویستمان بەم قسانەیە. ماڵەکەمان لە خزمەتدایە و کوڕیشمان نییە، کەمێکی تر دابنیشتیتایە...

هیچ وەڵامی نەبوو. دایکیشم بەردەوام بوو:

– لەکوێوە هاتویت و بۆ کوێ دەچیت؟ تۆ کێیت؟ خۆ هێشتا خۆت نەناساندووە.

هیچ لای نەکردەوە، دەتوت هەر گوێیشی لە پرسیارەکان نەبووە، تەنیا وتی:

– بەخوام سپاردی هاوڕێی دواڕۆژم. پاشان ڕۆیشت.

من و دایکیشم بەسەرسامیماینەوە. ئەو ئافرەتە کێ بوو کە وەك فریشتەیەك هات و بێدەنگ بەجێی هێشتین، دەتوت زانایەکە قسەدەکات.

ئەو ڕۆژە لەگەڵ دایکمدا هەر ئەوەمان لێکدەدایەوە، پوورە هاجەریش دەربارەی ئەو ئافرەتە دەیوت:

– ئەمە شتێك نییە نەیزانین. ئەو بەندەیەك بوو لەو بەندە نەبینراوانەی خوا. ئەگەر دەڵێیت ئەم دونیایە لەناو ئەم هەموو زوڵم و پیسی و گوناهەدا چۆن دەڕوات بەڕێوە ئەوا بەهۆی ئەم مرۆڤە باشانەوەیە.

بۆ چەند مانگێك لەژێر کاریگەری قسەکانی ئەو خانمەدا مامەوە. وەك نموونەکەی ئەو دەمویست ببمە سێوێکی پێگەیشتوو، بەڵام بارودۆخی قوتابخانە و، هاوڕێی سەرەڕۆ و، ئەو گەنجە نییەت خراپانەی لە دەورم بوون زوو منیان گۆڕییەوە، دووبارە کەوتمەوە داوی ئەو ڕۆژە ترسناکانە.

## پوورە نوور

لەو ڕۆژانەدا کە ژیانم بە تەواوەتی تێکچووبوو و، بەئارەزووی خۆم لەگەڵ کوڕاندا دەگەڕام، پوورە نوور ئامۆژگاری دەکردم. ئەو وەك خوشکی گەورەی هەموو قوتابیانی پۆلەکە وابوو، هەروەك ناوەکەی نوورانیی بوو.

پوورە نوور بەهۆی نەخۆشییەوە درەنگ چووبووە قوتابخانە. لەبەرئەوە تەمەنی لە ئێمە گەورەتر بوو. ژیریی و، سەنگینی و، دینداری و کۆششی وای لێکردبوو هەموو پۆلەکە بە "پوورە نوور" بانگی بکەن. وەك مامۆستا پۆلەکەی بەڕێوە دەبرد. ڕۆژێك بانگی کردم و داینیشاندم:

– سەیرکە سێڤدا گیان خوشکەکەم! من حاڵی تۆ و خێزانەکەت دەزانم، خۆت دەزانیت یەکێکیت لەو کچانەی کە زۆرم خۆشدەوێیت. دوو هۆکار وام لێ دەکات کە تۆم خۆشبوێت و گرنگیەکی زیاترت پێبدەم. یەکەمیان

منیش باوکم نییە، منیش لەناو ئەو نارەحەتیانەدام، لەبەرئەوە لە تۆ تێدەگەم. دووەمیش ئەوەیە کە تۆ کچێکی زۆر پاك و بێ گوناهیت. وا دەزانیت هەموو کەس وەك تۆ نیەتی پاکە. بەرامبەر هیچ کەسێك نیەتێکی خراپت نییە. پارێزگاری لە خۆت ناکەیت. بەڵام ئەم ڕۆژانە بەجۆرێك هەڵسوکەوت دەکەیت کە بەرەو هەڵدێرت دەبات، لەوانەیە خۆیشت بزانی. کەمێك لەم مەسەلەیەدا ئاگات لەخۆت بێت. قوتابخانە تەواو دەکەیت و لە تاقیکردەوەی زانکۆدا نمرەیەکی باش دەهێنیت و دواتر دەبیتە خاوەن کارێکی باشیش. هەم خۆت ڕزگارت دەبێت و هەم دڵی دایکیشت خۆش دەکەیت.

ئیتر تێگەیشتم دەیەوێت بڵێت چی، بۆیە وتم:

– زۆر هاوڕێی ترم هەن هەر بەو جۆرە هەڵسوکەوت دەکەن، پوورە نوور، تۆ ئەم ڕووداوانە تۆزێك گەورە دەکەیت.

– تۆ ناتوانیت وەك ئەو هاوڕێیانەت بیت. ئەوان پێداویستی تەواویان لەبەردەستدایە، دەوروبەرێکی باشیان هەیە، هاوکارییەکی گەورە لەخێزانەکانیانەوە وەردەگرن. ئەوان ئەگەر سەرکەوتووش نەبن زۆر شتیان لەدەست دەرناچێت، چونکە باری ئابوورییان خراپ نییە. کارێك دەدۆزنەوە، یان شوویەکی باش دەکەن و دەتوانن دڵخۆش بن لە ژیانیاندا. بەڵام کەسانێکی وەك ئێمە کە لە خێزانێکی هەژارەوە هاتووین، ئەگەر سەرکەوتوو نەبین یان تووشی نارەحەتییەك ببین کێ یارمەتیمان دەدات؟ کێ دەستمان دەگرێت؟

## کەسێك بکەوێت، کەس خۆی ناکات بە خاوەنی

خۆت باش دەزانیت کەسێك بکەوێت ئیتر کەس خۆی ناکات بە خاوەنی، ئێستا جوان و، شۆخ و شەنگیت، سەرنجی هەموو کوڕێك ڕادەکێشیت. ئەوان گرنگی بە بەختەوەری و ئایندەی تۆ و خێزانەکەت نادەن، بەڵکو دەیانەوێت بۆ ئارەزووە کاتیەکانیان بەکارتبهێنن. نموونەیە بۆ ئەو داوانەی لە دەوروبەرتدا دانراون و نایانبینی. تکایە لەمە تێبگە، زیانت پێ دەگەیەنن و ژیانت تاریك دەکەن.

– نەخێر من ڕێگە نادەم وا هەڵسوکەوت بکەن. پاشان کوا هەموو هاوڕێیەتییەکی کوڕ و کچ خراپە. ئەی منیش مافی ژیانم نییە؟

– بەدڵنیاییەوە هەتە، حەزکردن لە ژیان و، گەڕان و بەختەوەریش مافی خۆتە. بەڵام کە دەڵێیت: " ئەم مافەی خۆم بەمجۆرە بەکاردەهێنم" دەترسم هەموو مافەکانی تری ژیانت لەدەست بدەیت.

بۆ خاتری خوا، تۆ لە دڵتەوە باوەڕت بە هاوڕێیەتییەکی پاك و خاوێنی نێوان کچ و کوڕ هەیە؟! کە دوو جیهانی جیاوازن، چۆن بۆ ماوەیەکی زۆر بە پاك و خاوێنی بە یەکەوە دەمێننەوە؟ هەموومان بەیەکەوە دەرئەنجامە خراپەکانی ئەمە دەبینین. سەیری (فیگان) بکە... دەماری دەستی خۆی بڕی و خەریك بوو خۆی بکوژێت... یان (بانو)... کە بەجێیان هێشت ژیانی تاریك بوو. سەیری (سیڤگی) بکە... لەماڵ ڕایکرد.

هەموو ئەمانە دەرئەنجامی ئەو هاوڕێیەتییە بێسوود و بێپێوەرە نییە کە لەنێوان کچ و کوڕدا هەیە؟!

تۆ خوێندن تەواو بکەو کارێك بدۆزەرەوە. کە وات کرد زۆر کەس لە دەرگــات دەدات. ئــەو کاتــە کێــت دەوێــت هەڵیدەبــژێریت. ئەوەشــت بیرنەچێت، کە ویستت کارێك بکەیت یەکەمجار پرس بە دڵ و ویژدانی خۆت بکە. ئەو ڕێی ڕاستت پیشان دەدات.

هەموو شتێك لەگەڵ دایکت باس بکە، پلان بۆ هەموو کارێك دابنێ پاشان بیکە. ئەگەرنا ئەم جوانیەت سەرت دەخوات.

هەموو ئەوەی دەیوت ڕاست بوو. هیچ شتێك نەبوو کە بۆی زیاد بکەم. بگرە لەهەندێك شوێندا بۆ ئەوەی دڵی من نەشکێنێت کەمی وت.

دووبارە بۆ چەند مانگێك هاتمەوە سەر خۆم، بەڵام ئەو جیهانە ڕەنگاوڕەنگەی خرابووە بەردەستم، ئەو گرنگیەی پێم دەدرا ، ئەو گەنجانەی لەدەوروبەرم دەسوڕانەوە. دڵە پاك و پڕ لەنیەتە چاکەکەمیان دووبارە تێك دایەوە.

دیاربوو من ئاقڵ نەدەبووم، وەك بڵێی بۆ ئەوەی ئاقڵ ببم و ڕاستییەکان بزانم پێویست بوو سەرم بکێشم بە بەردێکدا. ئەو خەونە خەریك بوو بەرەو هەڵدێر دەیبردم. ئەوەبوو ئەو ڕۆژە پڕ ئازارانە سەرەتایان دەرکەوتبوو.

ئەو حەزە وەکو کرمێك چووبووە سەرمەوە. دەمویست بچمە ناو ئەو جیهانە ئەفسووناوییەوە. ئەو جیهانەی ڕایدەکێشام زۆر جوان و ڕەنگاوڕەنگ بوو.

خواردنەوە، جگەرە، ڕابواردن، دەمەتەقێی نێوان هاوڕێیان...

ناوبانگ دەرکردن، بوونە هەواڵ لە ڕۆژنامەکاندا.

کەوتنە سەر زمانی هەموو کەسێك...
ئەمانە هەمووی منیان مەست کردبوو.
ئەی باشە دەرئەنجامەکانی چی؟
بەڕاستی ئەوە دەبووە بەڵا بەسەرمەوە.

# بەشی سێیەم



زۆر جوان و، شۆخ و شەنگ بووم. لە هەژاری و تەنیایی بێزار بووم. دەمویست هەستم پێبکەن و گرنگیم پێبدەن. خەیاڵی زۆر جوانم هەبوو، لە ئاسماندا دەفڕیم. هەرچیم دەکرد نەمدەویست ئەو بازرگانانە ببینم کە بازرگانییان بە نامووسی خەڵکەوە دەکرد.
بەڵام مەخابن هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە ئەمە ڕێگە بۆ تراژیدیایەکی وا خۆش دەکات...



# لەپێناو خەیاڵەکانی هەرزەییمدا
# هیچ نەمایەوە نەیکەمە قوربانی



**دەمویست ناوبانگ دەربکەم و لە هەژاری رزگارم ببێت**

ئاخ لەدەست ئەو ڕووداوانە... خۆزگە ڕوویان نەدایە. خۆزگە ئەو ڕووداوانەم نەبینیایە و لەناو یادەوەرییەکانمدا شتی لەو جۆرە نەبووایە.

ئیتر هەرزەیی ئاوایە... خەیاڵی سەیرو سەمەرە، بیرۆکەی شیرین و جوان، جیهانێکی ئاڵۆواڵا... لەو ساڵانەدا هیچ شتێك نییە ئارەزووی نەکەیت.

لە پۆلی سێیەمی ئامادەیی بووم. هەموو هاوڕێکانم خۆشەویستیان هەبوو. هەندێك کوڕیش گرنگییان بە من دەدا. زۆر پێم خۆشبوو ئاوا گرنگیم پێبدەن. زۆر حەزم دەکرد ڕووی خۆشم پێبدەن، دەمویست دەوروبەرم بە بایەخەوە سەیرم بکەن. بێکەسی و بەش خوراوی منداڵیم وای لێ کردبووم ڕوو لە بیرۆکەیەکی وا بکەم زۆر دڵخۆش دەبووم کە ڕووی خۆشیان پێدەدام. وامدەزانی ئەوە یەکەمجارە بە مرۆڤم دادەنێن، بەڵام لە تەمەنێکدا نەبووم کە هەست بەڕاستی بکەم. لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژانەی وێرانیان دەکرم نزیك بوون.

کە لەپۆلی سێی ئامادەیی بووم. گەنجێکم ناسی. بە قسەی خۆی عاشقم بوو، دەیوت کە بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەندە و هاوسەرەکەی تازە وەفاتی کردووەو، بەدوای کچێکدا دەگەڕێت کە لە خێزانێکی بەڕەوشت بێت. هەروەها دەیوت ئەگەر شووی پێبکەم هەم ئاگای لە دایکم دەبێت و هەم لە هەژارییش ڕزگارمان دەکات. منیش لەبەر ئایندەی دایکم و بەختەوەری خۆم حەزمدەکرد. زوو زوو یەکترمان دەبینی، تا دەهات زیاتر لە یەکتر نزیك دەبووینەوە.

بەپێی ئەوەی پێی وتم بنەماڵەکەی کچێکی هەژاری وەك منیان نەدەویست. هەروەها نەیدەتوانی دڵی ماڵەوەشیان بشکێنێت. چونکە ئەو کەسێکی ناسراو و بەشەرەف بوو. کە ئەمەم بۆ دایکم باس کرد بە توورەییەوە هاتەوە بە ڕوومدا: "شتی وا نەکەیت ها... هەرگیز هەوڵی شتێکی ئاوا شێتانە نەدەیت. هێشتا منداڵیت، جارێ تۆ خوێندن تەواو بکە. لە ئایندەدا کەسانی چاکتر دێنە داوات.

کێ متمانە بەوجۆرە کەسانە دەکات. خوانەکات لەوانەیە دەستت ببڕێت. توخوا بە هەڵەیەکی واوە مەیەرەوە بەردەمم، چونکە ئەوکاتە من ناتوانم بژیم."

نە دایکم و نە پوورە هاجەر ڕازی نەبوون بەوکارە. ئەوان بەو ئەزموونەی هەیان بوو ئەوەیان دەبینی کە ڕووی دەدا، بەڵام من ئەوەندە کوێر بووبووم یەك هەنگاو پێش خۆمم نەدەبینی. چ بەڵایەك لەمە گەورەترە بۆ کچێکی هەرزە؟

لەو ڕۆژانەشدا هەواڵێکم لە ناو ڕۆژنامەیەکدا خوێندەوە کە بە تەواوی ئەقڵی تێك دام، هەواڵەکە بەم شێوەیە بوو:

"دوای ئەوەی لە ماڵ ڕایکرد، ناوبانگی پەیدا کرد. ئەو کچە جوانەی لە بڕیارە زۆرەملێکانی دایك و باوکی بێزار بووبوو، بەهۆی یارمەتی بازرگانێکەوە بەناوبانگ بوو. لە ئێستاشدا داوا دەکرێت لە چەند فیلمێکدا ڕۆڵ ببینێت، هەروەها دەڵێت: تاکە ئامانجم ئەوەیە خۆم بسەلمێنم بۆ ئەوانەی بە بچووکم دادەنێن."

ئەو هەواڵە وەك هەورەبرووسکە دای لە سەرم. کەم تا زۆر منیش هەمان حاڵەتی ئەوم هەبوو. ئەگەرچی من دایك و باوکێکم نەبوو کە زۆرم لێ بکەن، بەڵام بەهۆی هەژاری و کەم دەرامەتیمەوە کەس گرنگی پێنەدەدام. بە مرۆڤیان نەدەزانیم. پێویست بوو ئەو کۆت و بەندە بشکێنم و لەو حاڵە ڕزگارم بێت. ئەو کاتە هەم خۆمم دەسەلماند و، هەم دایکیشم لە هەژاری ڕزگار دەکرد.

## دایکم لەسەرجێ و بەنەخۆشی بەجێ هێشت و لەماڵ ڕامکرد

لەو ڕۆژەدا هەڵەترین بڕیاری ژیانم دا. بەداخەوە نەمدەزانی ئەوە کارەساتێکی وا دروست دەکات کە وەك ئەوە وایە بەدەستی خۆم فەرمانی لەسێدارەدانی خۆمم ئیمزا کردبێت. لە کۆتاییدا لەگەڵ (هاکان) ی خۆشەویستمدا بڕیارماندا. هەڵبێین و جیهانێکی تازە بۆ خۆمان دروست بکەین.

بۆ بەیانی وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت هەستام، خۆم ڕازاندەوە، جانتاکەم هەڵگرت و لەماڵ دەرچووم. دایکی نەخۆشیشم لەجێگادا هەر

نرکە نرکی بوو. بۆ دوایین جار سەیری دایکم کرد. ئەوەندە ئازاری هەبوو کە لە دەم و چاویدا بەئاسانی دەردەکەوت. کە ئەوم بەو حاڵەوە بینی دڵم پڕبوو.

هەستم کرد ئەو کارەی دەیکەم هەڵەیە. ئاگرێك لە ناخمدا هەڵگیرسا. زۆر سەخت بوو دایکم لەو حاڵەدا بەجێ بهێڵم؟ دەنگێك لەناخمدا هاواری دەکرد و پێی دەوتم کە نەڕۆم.

ئایا دەبوایە پەشیمان ببەمەوە؟... نەخێر جارێکی تر ئەو هەلەم بۆ نەدەڕەخسا. لەدڵی خۆمدا دەموت هەم پوورە هاجەر ئاگای لە دایکم دەبێت. هەم خۆیشم کە کارەکانم بەتەواوی ڕیکخستەوە دێم و دایکیشم دەبەم.

بێئەوەی گوێ بەو دەنگەی ناخم بدەم ڕۆیشتم. بەڵام حاڵم زۆر خراپ بووبوو. کەمێك بەملاولادا هاتم. وام دەزانی دایکم لە دوامەوە هاوارم لێدەکات و دەڵێت: "کچم توخوا مەڕۆ و بەتەنیا جێم مەهێڵە!" کە چوومە کۆڵانەکە (هاکان) پێشوازی لێ کردم و وتی:

– چی بوو خۆشەویستم. دایکت کێشەیەکی دروست کرد؟

– نەخێر، بێئاگاداری ئەو هاتم، بەڵام بەرگەی دووری ئەو ناگرم.

لەوێدا دانیشتم و دەستم کرد بە گریان.

– تۆ خۆیشت دەزانیت بەچی ناڕەحەتیت؟ خۆ ئێمە دایکت بە تەنیا بەجێناهێڵین. مانگی هەنگوینیمان ئەوپەڕی دە ڕۆژ بۆ مانگێکی پێ دەچێت. دوایی دێینەوە ماڵێکی جوان دەکرین، دایکیشت دەهێنینە لای خۆمان. دوای ئەوە هەموو ڕۆژێکمان بە خۆشی دەبەینە سەر. دەبینی

ژیانێکی شاهانەی وەهات بۆ فەراهەم دەکەم کە هەموو هاوڕێکانت ئیرەییت پێ ببەن.

خۆم کۆکردەوە و چووینە ناو ئۆتۆمبێلەکەی ماکانەوە. گوایە ئیتر دەردەسەرییەکانم تەواو بوون و، هەموو بێچارەییەکانم کۆتاییان هاتووە. بەخەیاڵی خۆم بەرەو ئایندەیەکی خۆش و ڕازاوە هەنگاوم دەنا.

ئاخ! لەدەست خەیاڵەکانی هەرزەیی!...

کێ دەزانێت چەند کەس بوونەتە قوربانی هەڵەی لەم جۆرە.

هەزاران کەس؟ یان دەیان هەزار کەس. نازانم، چۆن بمزانیایە لەکاتێکدا منیش یەکێك بووم لەوان.

## بەرەو وڵاتی خەونەکان

بەرەو وڵاتی خەونەکان کەوتینەڕێ. ئەو ئۆتۆمبێلەی پێمان بوو بوو تا بڵێی پیشکەوتوو و جوان بوو. دەیوت:

– ئەمەم بۆ تۆ کڕیوە. ئەم شۆفێرەشم لەبەر تۆ گرتووە. لەمەودوا ئەمە شۆفێری تایبەتی تۆیە.

ئەو گەنجە سەیارەکەی لێ دەخوڕی سەرێکی ڕاوەشاند و وتی:

– لەژێر فەرمانی جەنابتاندام براژن.

بەڕاستی بەشتی ئاوا ڕانەهاتبووم. کەس تا ئەو کاتە ئاوا ڕووی خۆشی بە من نەدابوو، کەسیش ئاوا گرنگی پێ نەدابووم. ژیانێك دەستی پێکرد کە خاوەنی شۆفێری تایبەت بە خۆم و ئۆتۆمبێلی خۆم بووم...

دوای شەش حەوت کاژێر گەیشتینە ئەو ئوتێلەی کە لێی دەماینەوە. لەڕێگە جل و پێڵاوو جانتای نوێم کڕی. لەبەردەممدا بازرگانێك هەبوو کە

وەکو ئاو پارەی لەمندا سەرف دەکرد گوایە منی وەك شێت خۆش دەوێت. ئیتر لەو حاڵەتەدا کێ گوێ دەداتە پارە؟

لە هۆتێلێك بووین کە جوانی دەریا و دارستانی لەیەك کاتدا کۆکردبووەوە. بۆ خۆمان ڕۆژانێکی خۆشمان بەسەردەبرد، ئەو ژوورەی بۆ ئێمە دانرابوو بەڕاستی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. لەبەردەمیدا دەریا و لەبەرامبەریشیدا دارستانێکی سەوز. سەیری هەرکوێم دەکرد سەوزایی بوو. هاکان وتی:

- دە ڕۆژ لێرە دەبین. هەموو شتێك دێتە بەردەستمان، بۆ دە ڕۆژ بێئەوەی بیر لە هیچ شتێك بکەینەوە بۆ خۆمان دەژین.

که زانیم گەیشتووینە کۆتایی ڕێگەکە پرسیم:

- ئەی مارە ناکرێین لە یەك؟

- کە گەڕاینەوە بە ڕەسمی لەیەکتر مارە دەکرێین. واز لە مارەکردنی ئایینیش بهێنە. من باوەڕم بە شتی وا نییە. هێندە بەسە مرۆڤ یەکێکی خۆشبوێت. چ پێویست دەکات خەڵکی تر ئاگادار بن؟ ئێمە دڵخۆش بووین ئیتر چ پێویست بە شایەت دەکات؟ شایەت هەبێت یان نەبێت جیاوازی نییە.

بێدەنگ بووم... لەو وڵاتی خەونەدا سەرخۆش بووبووم. بیرم لە هیچ شتێك نەدەکردەوە. لەو کاتەدا وتی:

- تۆ چەند سەعاتێك بنوو. من لە خوارەوە هەندێك پێداویستی دەکڕم. سەیرێکی دەوروبەریش دەکەم بزانم کوێ هەیە بگەڕێین. لەماوەی دوو سەعاتدا دێمەوە.

هاکان چووە دەرەوە، بەڵام کە چوو هەستم کرد بەشێوەیەکی تر سەیرم دەکات، وەك ئەوەی پێم بڵێت: "خوات لەگەڵ ئەی کچە گێلەکە. دواترین قوربانیم تۆ بوویت."

## مانگی هەنگوینی و لەناوچوونی هەموو ئومێدەکانم

جلەکانم داکەند، خۆم شت و پاڵ کەوتم. زۆر هیلاك بووم. خێرا خەوم لێکەوت. بەدەنگی تەلەفۆنەکە بەئاگا هاتم. هاکان بوو وتی:

– خۆشەویستم. من وا دێمە سەرەوە. شتێکت ناوێت.

– نەخێر

– باشە ئەوا دێم، دەرگاکە بە کراوەیی بەجێبهێڵە.

هەستام، دەرگاکەم کردەوە و چاوەڕێی هاکان بووم، بەڵام لەناکاو کەسێکی دڕندەی ورگ زل خۆی کرد بە ژووردا کە هەر نەمدەناسی. زۆر سەرم سوڕما بەپەلە خۆم کۆکردەوە و بە شڵەژانێکی زۆرەوە وتم:

– تۆ کێیت؟

وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت خۆی هەڵدایە سەر قەنەفەکەی بەرامبەرم. منیش قیژاندم بەسەریدا:

– خێرا بڕۆ دەرەوە. ئێستا هاکان دێتەوە. کە ئەو هاتەوە چی دەکەیت.

زۆر خراپ دەستی کرد بە پێکەنین و وتی:

– هاکان نایەت جوانەکەم. ئەو تۆی بۆ من هێنا. ئیشی خۆی تەواو کرد، پارەکەی وەرگرت و ڕۆیشت.

ئای خوایەگیان! چەندین بۆمب لەناو مێشکمدا تەقینەوە. وامزانی لەشم بووە بە هەزار پارچەوە. بەرچاوم ڕەش بوو.

لەشـوێنی خۆمـدا کـەوتم و دەسـتم کـرد بـە هـاوارکردن. بـەدوای ڕووناکیەکدا دەگەڕام بەڵام دەستم نەدەکەوت.

لـەو شـوێنەدا هـەموو شـتێکیان بـە شـێوەیەك داڕشـتبووە، کـەس نەیدەتوانی بگاتە هاوارم.

ئیتر لە دونیادا کچێك نەبوو بەناوی سێڤدا... هەموو شتێکم لەدەست دابوو، تەنانەت خۆیشم لێ ونبووبوو. جوانی و پاکێتیم پیس بوون و لەگەڵ خەیاڵەکانمدا خرابوونە زبڵدانەوە.

وەك شریتی فیلمێك هەموو پاڕانەوەکانی دایکم و پوورە نوور و پوورە هاجەر هاتنەوە یادم کە چۆن لێم دەپاڕانەوە تاکو تووشی ئەم کارە پیسە نەبم. وام دەزانی ئەوە کۆتایی ژیانمە. وەکو کچێکی گـەنج هـیچ شـتێکی ترم نەمابوو کە لەدەستی بدەم. تەنیا یـەك شـتم لـە مێشـکدا بـوو ئـەویش ئەوەبوو، هەرچی زووترە بمرم و ڕزگارم بێت.

دە ڕۆژ لەوێ مامەوە، نەمدەزانی کێ دێت و دەڕوات. ئەو کچەی لای دایکـە نەخۆشـەکەیەوە بـە پـاکی هاتـە دەرەوە، ئێسـتا هـەموو گیـانی هەڵکێشراوە لە تاوان.

ئەو گورگە برسـیانەی دەوروبـەرم بێئـەوەی بـەزەییان پێمـدا بێتـەوە خـەیاڵ و هەسـت و سـۆزیان پارچـە پارچـە کـردم. زۆر هـاوارم کـرد، زۆر پاڕامـەوە، بـەڵام بـۆ تـەنیا جارێـك دادی نـەداو گوێیـان لـێ نـەگرتم و بـۆ ساتێکیش ویژدانیان نەجووڵا.

## حەزمدەكرد بمرم

هەموو شتێكیان وا ڕێكخسبوو كە نەمدەتوانی ڕابكەم. پەنجەرەو دەرگاكان داخرابوون. لە ژوورەكەدا هیچ كەرەستەیەكی وەك چەقۆ یان گوریسی لێ نەبوو. ویستم حەوزی گەرمارەكە پڕ بكەم لە ئاو و لەوێدا خۆم بخنكێنم، بەڵام نەمتوانی...

بەڕاستی زۆر ترسناك بوو. حەزمدەكرد بمرم، بەڵام نەمدەتوانی خۆم بكوژم. ئێوە سەیری حاڵی ئەم كچە بكەن كە بۆچی هات و تووشی چی بوو.

خوایەگیان چەند بەسۆیە! چەندە ترسناكە!

دە ڕۆژ بوو دایكم نەبینیبوو. دەمزانی لەو دە ڕۆژەی كە هێندەی دە ساڵ درێژ بوو چەند بیری كردووم. بەڵام ئیتر نەمدەتوانی بڕۆمەوە بۆلای، نەمدەتوانی قسەی لەگەڵدا بكەم. بەو حاڵەمەوە چۆن ڕووم بێت گوێم لەدەنگی بێت، تازە بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەم نەبوو دەستی لێبدەم.

ئای دایەگیان! بۆ دەبێت من وام لێبێت؟ بۆ دەبێت من ئاوا بە تۆ بكەم؟ ئاخر نەخۆشییەكانی خۆت كەم بوون، وا من ئەم ئازارەشم بۆ زیاد كردیت؟

خوا من لەناویەرێت! من ئیتر ئافرەتێكی سوكم، لەم كۆمەڵگەیەدا جێم نابێتەوە. پێویستە هەرچی زووترە بمرم. بەڵام ناتوانم خۆم بكوژم... ئێستا دەزانم كە مردنیش هێندەی ژیان قورسە.

## ڕامکرد

ئافرەتێك خواردنی دەهێناو دەبرد. دیاربوو کە زۆریان لێکردبوو، کە دەهات بێنەوەی یەك وشەش بڵێت دەڕۆیشتە دەرەوە، بەڵام جارێك زۆر لێی پاڕامەوە:

– ئەگەر منداڵت هەیە بۆ خاتری ئەوان گوێم لێبگرە. منیان لە دایکێکی نەخۆش جیاکردەوە. باوکم نییە. تەنیا مردن من پاك دەکاتەوە، تکایە چەقۆیەك، گوریسێك، شتێکم بۆ بهێنە تا خۆم بکوژم و ڕزگارم بێت لەم پیسییە. لێت دەپاڕێمەوە یارمەتیم بدە.

دڵی پڕ بوو. زۆر بەزەیی پێمدا هاتەوە، وتی:

– من ناتوانم یارمەتیت بدەم. چونکە کەمێك لەولاوە پیاوەکانی ئاغا یەڵماز وەستاون.

ئەمە مانای ئەوەبوو ئەو کەسەی منی بەو حاڵە گەیاند بوو و کردبوومی بەو جەستە بێگیانە، ئاغا یەڵمازی لەعنەتییە! دوبارە داوام لەو ئافرەتە کرد:

– تۆ نەخشەی ئەم شوێنە دەزانیت، ڕێیەکی دەرچوونم پیشان بدە. تکات لێ دەکەم لێرە ڕزگارم بکە.

نازانم ناوی چی لێبنێت. ڕزگاربوون؟ ڕاکردن؟ یان زیاتر چەقین لەناو ئەو زەلکاوەدا؟

ماڵی ئەو ئافرەتە ئاوەدان بێت منی ڕزگارکرد. زۆر بە ئەستەم گەیشتمەوە شار، بەڵام بۆ کوێ بڕۆم؟ بۆلای کێ؟ لەدەرگای کێ بدەم؟ لە ناوەڕاستی ئەو شارەدا بێئەوەی پارەیەکی ئەوتۆم پێ بێت. هەموو شتێکم

لەدەست چوو. تەنانەت نەمدەتوانی بڵێم: "خوایەگیان یارمەتیم بدە." بە چ ڕوویەکەوە داوای یارمەتی لە خوا بکەم. وەك کەسێکی ئاوا تاوانبار؟ یان وەك منداڵێکی بێخێر کە دایکی لەسەر جێ بە نەخۆشی بەجێ هێشتووە؟

زۆر بێچارەو برسی بووم، سەمونێکم کڕی و پاڵم دایەوە بە دیواری پارکێکەوە، مێشکم ئەوەندە جەنجاڵ بوو بەرپێی خۆم نەدەبینی، تەواو بێهیوا بووم.

## بانگەوازەکەم بینی

لەو پارچە ڕۆژنامەیەدا کە پێچرابوو بە سەموونەکەوە بانگەوازێك نووسرابوو: "بەدوای خزمەتکارێکی بەتوانادا دەگەڕێین کە بتوانێت ئاگای لە ئافرەتێکی پیر بێت."

بە ئومێدی ئەوەی ببێتە چارەیەك بۆ دەردەکەم، تەلەفۆنم کرد بۆ ئەو ژمارەیەی کە نووسرابوو. لەڕاستیدا ئافرەتێکی پیر وەڵامی دایەوە، ناونیشانەکەی خۆی پێدام و داوای لێکردم کە بڕۆم تا چاوی پێم بکەوێت.

لەلایەك ئومێدم هەبوو کە ئەمە ڕێیەکی ڕزگاربوون بێت، لەلایەکی دیکەوە لەوە دەترسام هەمان ڕووداوم بەسەردا بێتەوە. لەناو ئەو شارەدا بە برسێتی چیم بکردایە؟ هیچ نەبێت لەوێ جێیەك بۆ مانەوەم دابین دەکرد.

بەهەزار بیرۆکەی پێچەوانەوە ماڵەکەم دۆزییەوە، دەستم بە زەنگەکەدا نا، ئافرەتێکی پیر دەرگاکەی کردەوە و بە دەنگێکی پڕ متمانەوە وتی:

– وەرە کچم، وابزانم تۆ ئەو کەسەیت کە تەلەفۆنت کردبوو.

– بەڵێ، من بووم.

بردمیە ژوورەوە.

– سەیرکە کچم، زۆر کەس ئەم بانگەوازەی بینیوە و تەلەفۆنی بۆ کردووین. ئێمە کەسمان قبوڵ نەکردووە. چونکە ئێرە شوێنێکە بە شەرەف و ڕێز ناسراوە. ئەوەی کە دێتە ماڵمان دەبێت ڕاستگۆ و بەڕەوشت بێت. خۆ من دەبینیت، بە تەنیا دەژیم. دەست و قاچم دەلەرزێت، کاری تۆ هەر ئەوەیە هاوڕێیەتی من بکەیت و لەنزیکەوە ئاگات لەحاڵم بێت.

بەبێ چارەییەوە وەڵامم دایەوە:

– من ئەو کەسەم تۆ بەدوایدا دەگەڕێیت. هەموو کارێکت بۆ دەکەم، تەنیا قبوڵم بکە.

– دەی مادام وایە پەلە مەکە. پێکەوە زۆر قسە دەکەین لەم بارەیەوە. تۆ جارێ کەمێك پشوو بدە. کاتمان زۆرە بۆ قسەکردن.

لەسەر یەکێك لە قەنەفەکان دانیشتم. ماڵەکە زۆر گەورە و جوان بوو، هەروەها زۆر بە جوانی ڕێك خرابوو. بەڕاستی نەدەچووە عەقڵمەوە کە ئەم ئافرەتە لەم ماڵە گەورەیەدا بە تەنیا بژی. کەوتبوومە گومانەوە بەڵام قسەکردنی ئەو ئافرەتە کەمێك متمانەی پێ بەخشیبووم. پاش کەمێك بانگی کردمە چێشتخانەکە و وتی:

– با کەمێك نان بخۆین. دواتر دادەنیشین و قسەدەکەین.

که چوومه چێشتخانەکه بیبینم زۆر سەرنجڕاکێشە. یەکەمجارم بوو شوێنێکی ئاوا ببینم. زۆر دڵخۆش بووم که لە جێیەکی ئاوادا کار بکەم. بەڵام چ دڵخۆشیەك...

زۆر به درێژی باسی خۆمم بۆ کرد. جا به شێوەیەك باسم کرد که ئەو بەدڵی بێت. پێم وت که له شارێکی ترەوه هاتووم و ئەو بانگەوازەم لەڕێی هاوڕێیەکمەوه پێگەیشتووه، پێشم وت که دایکم نەخۆشە و خاوەنی ئەزموونێکی باشی چاودێریکردنی خەڵکی پیرم هەیە. بەڵام سەرنجمدا هیچ گوێ لەمن ناگرێت و، گرنگی بەو چیرۆکه پڕئازارەی من نادات. وەك ئەوەی بیەوێت کاتم پێوه بکوژێت. له کۆتاییدا وتی:

– باشە، تۆ وەردەگرم. مادام ماڵتان له شارێکی تره لێرە جێیەکت دەدەمێ. لێرە دەمێنیتەوه، هەندێك جاریش منداڵی ئەو خزمانەم دێنە ئێره. بۆ ئەوەیان کێشەت نەبێت. ئێمه خانەوادەیەکی خاوەن ئابڕووین.

## بەڵایەکی تر

زوو زوو باسی ناموس و ڕەوشتی دەکرد. ئەوەش منی خستبووه گومانەوه. وەك ئەوەی لەکەیەکی بەسەرەوه بێت و بیەوێت پاکی بکاتەوه. ژوورێکی نیشان دام. وتی:

– تۆ لێرە دەمێنییتەوه.

ئەوێ ژوورێك نەبوو! بەڵکو ماڵێك بوو لەناو ئەو ماڵەدا، هەر لەناو ژوورەکەدا تەوالێت و گەرماوی تێدابوو. چێشتخانەیەکی بچووك، تەلەفیزیۆنێك و سەلاجەیەکی تێدا بوو.

بەڕاستی سەرم سوڕمابوو... پێم وابوو کە نەخشەی هەموو خانووەکە ئاوایە. کە شەو هات چوومە ژوورەکەی خۆم، هێشتا ئەو سەرسامیەم لەکۆڵ نەبووبووەوە. هەمان ڕووداو ڕوویدایەوە. پیاوێك خۆی کرد بە ژووردا. منیش لێم پرسی:

- تۆ کێیت؟ چیت دەوێت؟

- مەترسە، کەسێکی بێگانە نیم. خاوەنی ئەم ماڵەم.

- ئەی باشە خاوەنی ئەم ماڵە ئەو ئافرەتە پیرە نییە؟ من هاتم تا ئاگام لەو بێت.

- بەخێربێیت... خۆشیت هێناوە. بۆ شوێنێکی ڕاست هاتوویت. ئەم ماڵە خزمەتکاری لێ نابڕێت، یەکێ دێت و ئەوی تر دەڕوات...

که تێگەیشتم ئیتر چارەم نەماوە. دەستم کرد بە پاڕانەوە لێی:

- من کچێکی بێکەسم، هیچ نەبێ لەبەر ئەوە بەزەییتان پێمدا بێتەوە، وام پێ مەکەن.

بەدەم هاوارکردنەوە کەوتم بەسەر قاچیدا. داوام لێ کرد بەزەیی پێمدا بێتەوە، بەڵام ئەو هیچ گوێی نەدا بەوەی کە چی لە دەروونمدا هەیە. زۆر پاڕامەوە لێی وتم:

- تۆ لە خوا ناترسیت؟ ماڵ و منداڵت نییە؟ نازانیت ئەمانە هەموو حیسابی خۆیان هەیە؟

من لەکێ دەپاڕامەوە؟!! ئەگەر ئەو خوای بناسیایە کاری وەهای دەکرد؟ زۆر بە ناشیرینی وەڵامی دامەوە:

– من باوەڕم بە خواو ڕۆژی دوایی و قەدەر و ئەو جۆرە شتانە نییە! شتی وا ئەسڵی نییە. هەموو شتێك ئەم دنیایەیە. دەخۆیت و، دەخۆیتەوەو، ڕادەبوێریت... تێدەگەیت کچم!!! لەم شتانە بەولاوە پەیوەندی بە منەوە نییە. ئەو شتانە لەمێشکت فڕێ بدە. ئەگەر کەمێك مێشکت کار دەکات تا گەنج و جوانی ڕابوێرە. لە خوا و ڕۆژی دوایی و تاوان و ئەوشتانە مەترسە. ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاست بووایە، خوا دەهات و تۆی ڕزگار دەکرد. دەی کێ شتی وای بینیوە؟ کێ لەوێوە هەواڵێکی هێناوە؟ باسی چارەنووس و شتی واش مەکە! هەموو مرۆڤێك خۆی چارەنووسی خۆی دەنووسێت. ئەگەر خوا دەینووسێت بۆچی چارەنووسی خراپی بۆ تۆ نووسیوە و هی چاکیشی بۆ من داناوە؟

باوەڕ بەو شتانە مەکە... ئەگەر گوێ بدەیتە ئەو شتە پڕ و پووچانە، ژیانت لێ تاڵ دەبێت. خۆشی لێ نابینیت... ئەگەر ئەو شتانە لە مێشکت بسڕیتەوە ئەوا بەئارەزووی خۆت ڕادەبوێریت...

تێگەیشتیت؟!!

ئاگایشت لە خۆت بێت لێرە چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت...

## خوا ئەم ژیانەی من ببڕێت

منیان کردە ئەو ژوورەوە و دەرگایان لێداخستم، من بە نیازی ئەوە چووبووم کە ببمە خزمەتکار و خزمەتی ئەو ئافرەتە پیرە بکەم، کەچی ئەوەشیان پێ ڕەوا نەبینیم...

هەموو شەوێك میوانداریيەکی پڕ تاوان ساز دەکرا و ئەکتەری سەرەکیش من بووم. هەموو شەوێك دەبوومە کۆیلەی هەوا و ئارەزووی

یەکێکی دیکەو، هەموو ڕۆژێك پارچەیەکی تر لە گیانم دەپچڕا. تـا دەهـات زیاتر لەناو دەچووم. خوا ژیانێکی ئاوا ببڕێت...

گوایـە ئەگـەر ببێتـە کۆیلـەی ئارەزووەکـانی خـەڵکی ئـەوە ئازادییـە! خوایە گیان! ئەوە چ ڕابواردنێك بوو؟ ئاژەڵیش ئەوە قبوڵ ناکات.

دەرگاکەم لەسـەر داخرابوو، نەمـدەتوانی بڕۆمـە دەرەوە... ئـەوەی دەهــات کلیلــی پــێ بــوو دەرگاکــەی دەکـردەوە و ئــەوەی دەڕۆیشــت دەرگاکەی دادەخستەوە. نەمدەزانی چەند ڕۆژە لەوێم. کاتم بە تەواوی لێ تێکچووبوو. شەو و ڕۆژم لەیەکتر بۆ جیانەدەکرایـەوە. تەنانـەت دڵنیـایش نەبووم لەوەی کە ئایا زیندووم یان نا. جاری وا هـەبوو مێشـکم دەوەسـتا، خۆیشمم لەبیر دەچووەوە. ئاگام لەوە نەبوو کێ دێت و کێ دەڕوات. ئـیتر هـیچ شـتێك بـۆ مـن گرنگـی نـەبوو. لـەناو ئـەو دونیایـەی خۆمـدا وەك جەستەیەکی بـێ گیـان بـزر بووبـووم. تاکـە شـتێك کـە دەهاتـە گـوێم ئـەو دەنگەی دایکم بوو کە دەیوت:

"کچـم لـەکوێیت؟ ماویـت؟ مردوویـیت؟ هـەواڵێك بـە مـن بـدە. ئـیتر بەرگـەی دووریـت نـاگرم، تکایـە وەرەوە... زۆر بـیرت دەکـەم. تـۆ تـەنیا وەرەوە، من ئامادەم گەردنت ئازاد بکەم."

خوا من بکوژێت، کـێ هەیـە لـە مـن بـەد و تاوانبـارتر؟ کەسێك ئـەو هەموو ئازارە تووشی دایکی بکات، چۆن پێی دەوترێت مرۆڤ؟

## بە فێڵ خۆم بووراندەوە

دووبارە دەرگا دەکرایەوەو کەسێکی بێفـەڕ خـۆی دەکـرد بـە ژووردا. بیرۆکەیـەك هـات بـە مێشـکمدا... خـۆم فرێدایـە سـەر زەوی تـا وابـزانن

بوراوومەتەوە. ئەوەی کە هاتە ژوورەوە هاواری کرد: "وەرن ئەم کچە مردووە!". منیش هەوڵێکی زۆرم دا تا خۆم کۆنترۆڵ بکەم. ئەو ئافرەتە پیرە و پیاوێك خۆیان کرد بەژووردا. سێ کەس بە منەوە خەریك بوون. یەکێکیان لێدانی دڵی گرتم و وتی:

- ماوە، لەوانەیە بوورابێتەوە، کەمێك کۆڵۆنیا بهێنن، پاش کەمێك دێتەوە هۆش خۆی.

ئافرەتەکە زۆر ترسا:

- باشە چی دەبێت ئەگەر نەیەتەوە هۆش خۆی؟ دووبارە لەگەڵ پۆلیسدا تێکدەگیرێینەوە. با لەکۆڵی خۆمانی بکەینەوە، خۆ هەرچۆنێك بێت هەموو ڕۆژێك یەکێك دێت.

پیاوەکەی تەنیشتی پرسی:

- چۆن لە کۆڵی خۆمانی بکەینەوە.

- بیبەن سواری سەیارەیەکی بکەن. لەڕێگادا هاتەوە هۆش خۆی، بیگەڕێننەوە. نەهاتەوە هۆش خۆی، لەدەرەوەی شار لەجێیەکدا فڕێی بدەن.

- ئەی ئەگەر هاتەوە هۆش خۆی و، لەلای پۆلیس شکاتی لێکردین؟

- بیبەن بەردێك بکێشن بە سەریدا و بیکوژن.

ڕاست بوو خۆم بووراندبووەوە، بەڵام کە گوێم لەوە بوو ئەوان دەیانەوێت پێم بکەن زۆر ترسام، دواتر بەتەواوی خۆم کۆنترۆڵ کرد تا هەستم پێ نەکەن. لە لایەکیشەوە دڵم خۆش بوو بەوەی دەمکوژن. من

خۆم نەمدەتوانی خۆم بکوژم بەڵام با ئەوان بمکوژن و لەم زیندانەی کە پێی دەوترێت ژیان ڕزگارم بێت. ئافرەتەکە بەو پیاوەکەی تەنیشتی وت:

– ئەکرەم تۆ بیبە. تا کاری تەواو نەکەیت نەیەیتەوە. بیکەیتە بەلا بەسەرمەوە سەرت دەپەڕێنم.

منیان هەڵگرت و بردمیانە خوارەوە، چاوم کەمێك کردەوە بینیم ئەو ئەکرەمەی کە دەیوت گەنجێکە. یەکەمجارم بوو بیبینم. خستمیە دوای ئۆتۆمبێلەکە و بەخێرایی کەوتەڕێ و دوورکەوتەوە. ئۆتۆمبێلەکە زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت و منیش خۆم بۆ مردن ئامادە دەکرد.

ئەو چەند دەقیقەیەم بۆ باس ناکرێت. لەلایەکەوە دڵ خۆش بووم بەوەی کە دەمرم، لەلایەکی تریشەوە لە ترسی ئەو بەردەی کە دەیکێشا بە سەرمدا خەریك بوو دڵم دەوەستا.

## هاوارم دەکرد بمکوژە!

تەکسییەکە لەشار دەرچوو و چووە ناو ڕێگای دارستانێك، دەوروبەرمان سنەوبەری لێ بوو. دیار بوو شوێنێکی تەواو چۆڵبوو. بۆیە منیش هەستامەوە و وتم:

– من دەکوژیت ها؟

ئەکرەم ڕووی تێکردم و وتی:

– من لەژێر فەرمانەکانی ئەواندام، چی بڵێن ئەوە دەکەم.

– دەی کەواتە مەترسە و بێشڵەژان کارەکەت بکە، خۆ شتێك نەماوە من وا لێبکات لە ژیاندا بمێنم.

لە تەکسییەکە دابەزیم و لەژێر سنەوبەرێکی گەورەدا دانیشتم، دەستم گرت بە دەموچاومەوە و پێم وت:

- دەی زۆر بەخێرایی ئەم چاکەیەم لەگەڵ بکە. هیچ لێت توورە نابم، بگرە سوپاسیشت دەکەم.

ئەکرەم بۆ ماوەیەك بە پێوە وەستا... دڵنیام کەوتبووە ناو لێپرسینەوەیەکی ترسناکی ویژدانیەوە. بەئاسانی لە ڕووی دەخوێنرایەوە کە چ ڕەشەبایەك لە ناخیدا هەڵی کردووە.

هات لەبەردەممدا دانیشت و وتی:

- تۆ کێیت؟ چ کارەیت؟ چۆن ڕێت کەوتە ئێرە؟

دەتوت گوێم لەم قسەیە نەبووە، بە بەردەوامی دەپاڕامەوە لێی:

- ئەو بەردە هەڵبگرە بیکێشە بەسەرمدا، بەڕاستی دەمەوێت بمرم.

- دەمەوێت یارمەتیت بدەم، تا ئێستا خراپەم بەرامبەر کەس نەکردووە و دەستم نەچۆتە خوێنی کەس.

- ئەی ئەگەر وایە ئیشت چییە لەوێ؟

- منیش وەك تۆ بەدوای ئیشدا دەگەڕام، کەوتمە بەردەستیان. هەرچی دەکەم ڕزگارم نابێت. تەنیا چەند ئیشێکی سەرپێییان بۆ دەکەم و هیچ پەیوەندیم بەو کارە پیسانەوە نییە.

لە دەنگیدا وا دەردەکەوت کە ڕاست دەکات، یان بەلایەنی کەمەوە ڕۆڵەکەی جوان دەبینێت.

## دەمویست خۆم بکوژم، بەلاّم نەمدەتوانی

هەموو ڕووداوەکانم بۆ باس کرد. کە تەواو بووم وتی:

- پێویستە تۆ ڕزگار بکەم. هەرگیز ناتوانم بتکوژم...

- چۆن ئەمە دەکەیت؟

- وازت لێ دێنم بڕۆ، بەلاّم شکاتمان لێ مەکە. ئەوی تری بدەرە دەست من، بە درۆیەك مەسەلەکە لای ئەوان دادەخەم.

قیژاندم بەسەریدا:

- نەخێر... من هیچ جێیەکم نییە بۆی بڕۆم. نامەوێت دووبارە بکەومەوە ئەو داو و پیسیانەی کە تێی کەوتووم. تکات لێ دەکەم بۆ تۆ هیچی تێناچێت بمکوژە و ڕزگارم بکە.

من کەسێکم کۆتاییم پێ هاتووە بە تەواوی فەوتاوم، دوو فلس پارەم پێنییە و هیچیش بەم شارە ئاشنا نیم ئیتر چی بکەم لێرە ؟ دەی توخوا ئەم ئیشە بکەو کۆتاییم پێ بهێنە.

قۆڵی گرتم و وتی:

- وەرەو سواری ئەو ئۆتۆمبێلە ببە. من ناتوانم تۆ بکوژم، بەلاّم ئەگەر هەر دەتەوێت بمریت، ئەوا خۆت ئەو کارە بکە.

بەدەم خۆمەوە وڕێنەم دەکرد و دەموت: "ئاخ خۆزگە بمتوانیایە!.. ئاخ بمردمایە!.."

دەمویست بمرم بەلاّم نەمدەتوانی خۆم بکوژم.

ئێوە سەیری ئەم بێچارەییەی من بکەن، نە دەتوانم بمرم، نە دەتوانم بژیم. ژیانێکی ئاوا هەر نەبێت باشترە.

وتی:

– من خێزاندارم، کچێکی تەمەن سێ ساڵم هەیە. تۆ دەبەمە ماڵەوە، تا جێیەکی رێك و پێك دەدۆزیتەوە لەوێ دەبیت.

هاوارم کرد بەسەریدا:

– هەرگیز... ئیتر باوەڕم بە کەس نەماوە. هەموو کەسێك بێڕەوشت و درۆزنە لای من، هەموو کەسێك وەکو گورگ بەدوای گۆشتەوەیە...

وەڵامی دامەوە:

– خوشکەکەم، بە حاڵمدا دیارنییە؟!! ئەگەر بمەوێت خراپەیەکت لەگەڵ بکەم، لێرە بەتەنیاین کێ دەتوانێت دەستم بگرێت؟ بەڵام دڵنیابە کەسێکی وا نیم. تاکە ئارەزووم ئەوەیە یارمەتیت بدەم. خۆت باش بیر بکەرەوە.

## منی لەماڵی خۆیدا قبوڵ کرد

زۆر بەخێرایی تەکسییەکەی لێخوڕی و لەو شوێنە دوورکەوتەوە.

لە مێشکمدا دەیان هەزار بگرە ملیۆنان بیری ئاڵۆزو گومانی سەیرم هەبوو. نەمدەزانی چۆن و بەچ شێوەیەك کارەکان بەڕێبکەم. دەستم بۆ هەرکوێ دەبرد، لقێکم دەست نەدەکەوت دەستی پێوە بگرم، متمانەم بە هەرکەس بکردایە خیانەتی لێدەکردم. خوایەگیان دەبێت ئێستا چی بکەم؟!

بەناو شاردا دەڕۆیشتین کە ئەکرەم لەپڕ وتی:

– بڕیار بدە. دادەبەزیت یان لەگەڵمدا دێیتەوە بۆ ماڵەوە ؟

– بەڕاستی نامەوێت ببمە بار بەسەرتانەوە، بەم حاڵەمەوە ناتوانم پەنا بەرمە بەر کەس. خێزانت هەڵە تێدەگات، نێوانتان تێك دەچێت، مافی ئەوەم نییە نێوانتان تێك بدەم...

– نا نا خەمی ئەوەیانت نەبێت، هاوسەرەکەم باشترین مرۆڤی ئەم جیهانەیە. زیانێکت بۆ ئێمە نابێت، چەندێك دەتەوێت دەتوانیت بمێنیتەوە.

دەبوایە چیم بکردایە؟ ئایا دەمتوانی متمانە بەو پیاوە بکەم؟ تۆ بڵێی لەم دونیا تاریکەدا کەسانێکی ئاوا پاکیش هەبن؟

دەنگم نەکرد. ئەکرەمیش ئۆتۆمبێلەکەی بەرەو ماڵەوە لێخوڕی. هەر واش بوو، بەڕاستی هاوسەرێکی زۆر چاکی هەبوو، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کەسێك هەبێت ئەوەندە دڵفراوان و تێگەیشتوو و بەبەزەیی بێت. ئەمە مانای ئەوەیە هێشتا مرۆڤە چاکەکان هەر ماون.

سەلماخانی هاوسەری، بووە خوشکێکی گەورە بۆم، هەموو ژیانی منی دەزانی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش وەك میوانێکی زۆر بەڕێز هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم...

لەشی ئەکرەمیش ساغ بێت، کارێکی بۆ دۆزیمەوە. لە دوکانێکی سەرچاککردن کارم دەکرد، بەڵام لەوێش ئاسوودە نەبووم، دیسان دەوروبەرم پڕ بوو لە فرسەتچی. نازانم هەواڵی منیان لە کوێوە بیستبوو. زۆر حەزم دەکرد لەو کارە پیسانە دووربکەومەوە، بەڵام هەرچیم کرد ئەوانەی بازرگانیان بە ناموسی خەڵکەوە دەکرد بەرۆکیان

بەرنەدەدام، نازانم لەکوێوە بۆنیان کردبوو؟! مانگێک لە ماڵی ئەکرەم مامەوە دواتر چوومە بەشی ناوخۆیی...

هیچ شتێک بەرەو باشی نەدەڕۆیشت! نەمدەتوانی بێمەوە سەر ڕێی ڕاست. دایکم وەک ڕمێک هەموو کاتێک هەناوی پڕ دەکردم لە خوێن. یان دەبوایە بمردمایە یان بچوومایە دایکمم ببینیایە. ئەم بیرە تەواو حاڵەتی منی تێکدا. دەبوایە یەکێک لەو دوو ڕێیە بگرمەبەر، ئەگەرنا نەمدەتوانی لەم ژیانە بەردەوام بم...

# بەشی چوارەم



**ئەگەر کچێکی گەنج کەسێتی و شەرەف و**
**نامووس و هیواکانی بدۆڕێنێت چی دەکات؟**
**منیش بڕیارم دا ئەوە بکەم.**
**تەنیا یەك ڕێگەم لەبەردەمدا بوو...**



# ئیتر وەك جەستەیەكی بێ گیان وابووم



## بڕیاری خۆكوشتنم دا

بۆ من هەموو شتێك تەواو بووبوو، هیچ شتێكی ترم نەمابوو جگە لە جەستەیەكی بێ گیان، ئیتر من مرۆڤێكی لەكەدار و بێڕێز بووم و چەقیبوومە ناو كۆمەڵێك تاوانی زۆر گەورەوە. تازە جێیەكم بۆ نەمابووەوە لە دونیادا. مافی ئەوەم نەبوو كەسانی دەوروبەرم بێتاقەت بكەم و لەكەداریان بكەم.

ژیانم پێش ئەوەی دەست پێبكات تەواو بووبوو، هیواو خەیاڵەكانی هەرزەیی و لەسەرروو هەمووشیەوە شەرەفم خستبووە بەردەستی ئەو ڕاوچییانەو تەنیا پەشیمانی و فرمێسكم بۆ مابووەوە...

ئای دایەگیان!... تۆ منت بۆ ئەمانە پەروەردەكردبوو؟ لەناو ئەو هەموو ئێش و ئازارەی نەخۆشیەكانتدا منت بۆ ئەمە دەگوشی بە خۆتەوە، هەموو جارێك دەتوت: "ئەم كچەی من دەبێتە خاتوونێكی گەورە، كچی من دەبێتە نموونە بۆ هەموو كەس." بەداخەوە دایە گیان زۆر بەداخەوە كە تووشی نائومێدیم كردیت... من شایانی ئەوە نەبووم كچی تۆ بم. ئەو مرۆڤە بێویژدان و بێ ئینسافانە، لەژێر ناوی چاكەو خۆشیدا هەموو شتێكیان لێ سەندمەوە...

لە ناوەڕاستی شاردا تەنیابووم، دووبارە وازم لە ئیش هێنابوو و دوو ڕۆژ بوو برسی بووم، بەتەواوی هێزم لەبەر بڕابوو. موحتاجی پارچە نانێکی وشك بووم، ئەو دونیا ڕەنگاوڕەنگەو، ئەو ناوبانگەی هەموو خەڵکی ئاواتی پێ دەخوازن منی بەو حاڵە گەیاندبوو...

بڕیاری خۆکوشتنم دابوو! ئیتر نەمدەتوانی بەو ئازارانەوە بژیم. هێزم تیادا نەمابوو، کەسێتی خۆمم لەدەستدابوو، ئیتر جەستەیەکی بێ ناوەڕۆك و بێ سوود بووم، شتێکم نەمابوو بیفرۆشم بەو دڕندە گۆشتخۆرانە.

لە سووچێکی پارکێکدا و لە ژێر دارهەنجیرێکدا دانیشتم، ئەوەندە هیلاك و دەستەوەسان بووم دەپاڕامەوە و دەمووت: "مردن لەکوێی؟ وەرە و بمکوژە!"

بەڵام نەدەهات...

نەمدەتوانی بەو حاڵەمەوە بگەڕێمەوە ماڵەوە، ئەوەی کە پێم دەوت ماڵ ژێر زەمینی ماڵی پوورە هاجەر بوو، لەکاتێکدا کە بەجێم هێشت دایکم لەتاو ئازار دەیناڵاند...

ئاە دایکە ئازیزەکەم! ئێستا نازانم لە چ حاڵێکدایت. چەند مانگە هەواڵت نازانم. هێز و توانای گەڕانەوەم نییە...

نازانم دەژیت یان مردوویت؟ لەم دونیایەدا مردن لە ژیان زۆر خۆشترە.

ئاخر ژیانی من چ سوودێکی هەبوو؟ چی دەبوو پێش ئەوەی لەو ژیانە پیس و لەکەدارەدا ون ببم بمردمایە؟ ئەوکات بەپاك و خاوێنی

دەچوومەوە ئەو شوێنەی بۆی دەچم. هیچ نەبێت ویژدانم ئاسوودە دەبوو، کەسایەتیم بە پاك و خاوێنی دەمایەوە، وەك براکەم...

کاتێك لەنێوان ژیان و مردندا لە کێشمەکێشمێکی سەختدا بووم جەستە بێ شەکەت و ماندووەکەم ئەوەندە بەرگەی نەگرت و لەوێدا کەوتم.

## خەونێکی زۆر سەیر بوو

لەو شوێنە کە لێی کەوتبووم خەونێکم بینی ئاراستەی ژیانمی گۆڕی. لەدوای ئەوەی لە دایکم جیا بوومەوە یەکەمجارم بوو لە خەومدا دەمبینی. لەجێیەکی زۆر پاك و خاوێن و خۆشدا هاتە بەرچاوم. جلی زۆر جوانی لەبەردابوو، چاك بووبووەوە، قەڵەو بووبوو، ئەو ڕەنگە زەردەی ڕۆشتبوو، شێوەو ڕووخساری زۆر زۆر جوان بوو. برا ڕەحمەتییەکەشمی لەگەڵ بوو. لەکاتێکدا بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕەتم دەکاتەوە، بەڵام بە نەرم و نیانییەکی زۆرەوە باوەشی پیاکردم و وتی:

– کچم! زۆر بیرت دەکەم. خێرا مەوەستەو برۆ بۆلای پوورە هاجەرت، ئەو چاوەڕێت دەکات. ئەمە دوا شتە لە تۆی داوا دەکەم... دەی خێرا برۆ.

بێئەوەی بزانم چی ڕووی داوە بەئاگا هاتم، دەوروبەرم کەسی لێ نەبوو، لە پارکەکەدا لەناو دەردەکانی خۆمدا نوقم بووبووم... لەبەرئەوەی لەمێشکمدا دامنابوو کە دەماری دەستی خۆم ببڕم و خۆم بکوژم، لە سەرەتادا زۆر گوێم نەدا بەو داوایەی دایکم.

ئاخر لە ئێوە دەپرسم! کچێك کە بەهۆی تێوەگلانی لەهەموو ئەو کارە بەدو پیسانەدا بڕیاری خۆکوشتنی دابێت چۆن دەتوانێت لەبەردەم مرۆڤێکی پاکی وەك پوورە هاجەردا بوەستێت؟ بەو حاڵەمەوە کە نوقمی تاوان بوو بووم، چۆن دەمتوانی دەستە پاکەکانی ئەو ماچ بکەم و پیسی بکەم؟

ئای دایەگیان!.. تۆ نەتدەزانی لە چ دۆخێکدام.

لەو کاتەدا ئازارێك وەك هەورەبروسکە دای لە مێشکم، تۆ بڵێی دایکم مردبێت؟ ئەی ئەگەر دەژی بۆ نەیوت وەرەوە بۆلای خۆم وتی بڕۆ بۆلای پوورە هاجەرت؟ بۆ وتی ئەمە دوا ئارەزوومە لەتۆی داوا دەکەم و زۆر سوور بوو لەسەری؟ لەژیانمدا جگە لە ئازار هیچ شتێکم پێشکەش نەکردبوو ئیتر چۆن دەمتوانی کۆتا ویست و ئارەزووی ئەو پشت گوێ بخەم؟ ئایا دەکرا هەموو شتێك پشت گوێ بخەم و بچم بۆلای پوورە هاجەر؟ دایکم لەژێرزەمینی ماڵی پوورە هاجەردا دەژیا، لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەر لە ژیاندا بێت. پێش خۆکوشتن سەردانێکی ئەویش دەکەم. ئەوەبوو بڕیارم دا سەردانی ماڵی پوورە هاجەرم بکەم، دواتریش خۆم بکوژم...

تاکە شتێك کە لەمێشکمدا بوو، ئەوەبوو کە چۆن و بە چ ڕوویەکەوە خۆم پیشانی ئەو خانمە فریشتەئاسایە بدەم کە لەمنداڵیەوە وەك منداڵی خۆی پەروەردەی کردبووم... لەوە ناخۆشتر دایکم کە لەو هەموو ئازارەدا جێم هیشتبوو چۆن لێم خۆش دەبێت؟

بەدەم خۆمەوە وتم خۆ من مردوویەکی گەڕۆکم. گرنگ نییە چیم پێ دەڵێن، چی دەڵێن با بڵێن. کە من دوای چەند ڕۆژێك خۆم کوشت هەموو ئەمانە لە دوای خۆم بەجێ دەهێڵم...

## بەگوێی دایکمم کرد

ڕۆیشتم. بەڵام بە چەند تاوانێکەوە کە لێخۆشبوونیان نەبوو، بە شەرەفێکی لەکەدار و ناموسێکی فرۆشراوەوە ڕۆیشتم... نەك ژیان لەو بارودۆخەدا، بەڵکو بیرکردنەوەیش لەو حاڵەتە دڵی مرۆڤ دەوەستێنێت...

نزیکی چێشتەنگاو بوو. دابەزیمە ئەو ژێرزەمینەی دایکمی لێ دەمایەوە، سەیرم کرد دەرگا داخراوە و بەردەم دەرگاکەش پێڵاوی لێ نییە. دام لە دەرگا و دەستم نا بە زەنگەکەدا، بەڵام هیچ دەنگێك نەبوو...

وتم: " لەوانەیە دایکم لەسەرەوە بێت، یان لەوانەیە شتێکی بەسەر هاتبێت. تۆ بڵێی بەڕاستی مردبێت؟"

دڵەخورپەیەکی سەیر ناخی داگیر کردم. لە جێی خۆم دانیشتم، تا ماوەیەك نەهاتمەوە سەر خۆم. دواتر چوومە سەرەوە بۆ ماڵی پوورە هاجەر. کە گەیشتمە بەردەم دەرگاکە ناخم پڕ بوو لە خورپە. نەمدەزانی چی ڕوو دەدات؟ کچێك کە ئەو هەموو تاوانەی کردووە، دەکرا درۆ بکات؟! دەبووایە چیرۆکی هەڵبەستایە یان دانیشتایە بگریایەو داوای لێخۆشبوونی بکردایە؟

نەمدەزانی... کاتێك لەنێو ئەو هەموو کێشمەکێشمەی ناخمدا بووم، لەپڕ دەرگا کرایەوە و لەگەڵ پوورە هاجەردا ڕووبەڕوو وەستاین.

ئای خوایەگیان!!! ئێوە سەیری ئەو ڕووخسارە پاك و بێگەردە بکەن. بە سیماو وەستانیەوە دووبارە منی شەیدای خۆی کردەوە.

## خانمێکی فریشتەئاسا

بۆ ماوەیەك ئەو نیگا شیرینانەی ئاڕاستەکردم و دواتر بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی:

– تۆ (سێڤدا)ی خۆمان نیت؟

ئیتر لە شەرمدا سەرم دانەواند. ئەوەندە تەریق بوومەوە کە لە عارەقی خۆمدا نقوم بووم. هیچ وەڵامم پێ نەبوو. منی خستە نێوان ئەو باڵەگەرم و گوڕانەیەوە.

– ئای کچم سێڤدا، خۆ ئەوە تۆیت. نازانیت چەندە بیرم دەکردیت.

قۆڵی ڕاکێشام:

– تۆ جارێ وەرە ژوورەوە. زۆر شت هەیە دەبێت پێکەوە باسی بکەین.

بردمیە ژوورەوە. ماڵێکی پاك و بێگەردی وای هەبوو کە دڵی مرۆڤی دەکردەوە. ئەو ماڵە بۆنی ئاسوودەیی لێوە دەهات و کاریگەری لەسەر هەموو گیانم دادەنا.

بە سۆز و بەزەیی دایکێکەوە بە دەورمدا دەسووڕایەوە. ئەمانە شتێك نەبوون دروستکراو بن. بەڵکو ئاوێنەی خۆشەویستی و سۆزی ناخی بوون.

– ڕۆڵەی خۆشەویستم. زۆر بێ تاقەت و هیلاك دیاریت. هەستە بڕۆ خۆت بشۆ. با منیش جلی پاکت بۆ بهێنم.

– دایکم لەکوێیە پوورە هاجەر؟

لەپڕ لەو ڕووە پڕ نوورەیدا هەوری خەم دەرکەوت و، لەو چاوە شیرینانەیدا دڵۆپ دڵۆپ فرمێسك ڕیزیان بەست.

تیغێك دای لە دڵم و ناخم کڵپەی سەند. پێشبینییەکەم ڕاست دەرچوو. دایکم لەو خەونەدا لە دونیایەکی ترەوە هاواری لێ کردم.

بەترس و لەرزەوە وتم:

- خوانەخواستە خۆ نەمردووە؟

بەدەنگێکی پڕ لەئازارەوە وەڵامی دایەوە:

- تەقدیری خوایە کچم.

## ئەو هەواڵە جەرگی لەت لەت کردم

لەو کاتەدا کەوتمە سەر زەوی... ئەوە دوا ڕووخانم بوو، لەهەموو دونیادا بەس ئەوم هەبوو ئەویش ڕۆیشت. ئیتر هەورەبرووسکەکانی مێشکم دوابڕیاریان پێ ئیمزا کردبووم.

"هەرچی زووترە دەبێت ئەم کارە تەواو بکەم."

پوورە هاجەر باوەشی پیاداکردمەوە و، وەك دایکێك دووبارە لە ئامێزی پڕسۆزی گرتم:

- تۆ نازانیت کچم. ئەو ئەوەندە بە مردنێکی جوان مرد، ئیرەیيم پێبرد و هیوام خواست لەجێی ئەوبم. چەند ڕۆژ پاڕامەوە لە خوا، کە منیش ئاوا بباتەوە.

هەموو شتێکت زۆر جوان بوو، هەموویت بۆ باس دەکەم. بڕوام پێبکە گیانەکەم، هەواڵی زۆر خۆشت پێ دەدەم. هیچ مەگری بەڵکو دڵت خۆشبێت و شانازی بە دایکتەوە بکە... ئەوەندە جوان بردیەوە لای خۆی

نـاتوانم باسـی دڵخۆشـی ئـەو کاتـەی بکـەم، دامـاوە لەژیانیـدا دڵخۆشـی نەبینی...

پووره هاجەر بەو زمانە شیرینەی خۆی دەیویست دڵم بداتـەوە، ئـەو دڵەمی حەساندەوە کە هیچی دەربـارەی بیروبـاوەڕ و ئیمـان و خـواو ڕۆژی دوایی تێدانەمابوو.

سەرمی بەرز کردەوە بە دەستە نەرمـەکانی و فرمێسـکەکانمی سـڕی. چەندین جار ڕوومەتەکانمی ماچکرد و دەستی هێنا بە سەرمدا.

من شایانی ئەو خۆشەویستییە نەبووم، من شایانی ئەو گرنگـی پێـدان و بەزەییە نەبووم، بەڵام پـووره هاجـەر فریشـتە بـوو، لەگـەڵ ئـەوەی کـە ئاگای لە زۆر شت بوو، بەڵام نەیدەهێشت هەستی پێ بکەم.

## چڵکەکانی جەستەم پاك دەبووەوە، بەڵام ڕۆحم....

پـێش هـەموو شـتێك بـەزۆر کردمـی بـە گەرماوەکـەدا، پاشـان جـل و بەرگی پاك و خاوێنی پێدام. لەدوای ئەو هـەموو ماوەیـە ئـەوە یەکـەمجارم بـوو بـە ئـاوێکی پـاك خـۆم دەشـت، چـڵکی جەسـتەم لاچـوو، بـەڵام ئـەو پیسییانەی لە گیانمدا بوون وەك خۆیان مابوونەوە.

لەگەرماوەکــە دەرچــووم ســەیرم کــرد خــواردنێکی زۆر خۆشــی ئامادەکردووە، چی هەبوو لەو خوانەدا نەبێت؟ هەرچی هەبوو بـەو دەسـتە پاك و پیرۆزەی خۆی کردبووی.

لەبەرامبەر خۆیەوە دای نیشاندم، سێ ڕۆژ بوو نانم نەخواردبوو، بۆیـە باش خۆم تێرکرد، هەم بەرامبەر یەك دانیشـتبووین نانمـان دەخـوارد هـەم باسی دایکمی بۆ دەگێڕامەوە:

- لەدوای ڕۆیشتنی تۆوە بەرگەی نەگرت، زۆر بیری دەکردیت. لەوە دەترسا تووشی شتێك ببیت. منیش بەتەنیا بەجێم نەدەهێشت، زۆرجار لەخوارەوە بە یەکەوە دەخەوتین.

لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا وەك فریشتەی لێهاتبوو. بە دڵ و گیان ڕووی کردبووە خوای گەورە، شەو و ڕۆژ باسی خوای گەورە لەسەر زاری بوو، هەم نزای بۆ من دەکرد هەم بۆ تۆ.

پێش یەك ڕۆژ لە وەفاتی وتی: "پوورە هاجەر، کچەکەم ئەمانەت بێ لای تۆ، خەونێکم بینی، ئەو دێت بۆلای تۆ، ئیتر نەهێڵیت بڕوات، من ڕێبوارم بەم نزیکانە دەڕۆم. منیان بانگ کرد، جێگەکەشمیان پێ نیشان دام."

منیش لێم پرسی: "لەکوێیە؟"

بەڵام وەڵامی نەبوو، کەوتە بیرکردنەوە، سەیرم کرد ڕووی وەك گوڵ گەشایەوە و زەردەخەنەیەك ڕووخساری گرتەوە، وەك ئەوەی ئەو شوێنەی بینیبێت کە بۆی دەڕوات، بۆیە زۆر دڵخۆش دیار بوو.

دوای یەك ڕۆژ و لەشەوی هەینیدا وەفاتی کرد، ئەوەندە مردنێکی جوان مرد هەر مەپرسە.

سەیرم کرد دووبارە پوورە هاجەر فرمێسك بەری چاوانی گرت و نیگاکانی بۆ شوێنێکی دوور ڕۆیشت.

منیش پاروەکە لە قوڕگمدا گیر بووبوو و نەدەچووە خوارەوە. تووشی شۆك بووبووم. بە بەردەوامی نەفرەتم لەخۆم دەکرد و داوای لێخۆشبوونم لە گیانی دایکم دەکرد.

## مردنی پڕ وانەی دایکم

پوورە هاجەر بەردەوام بوو لە باسکردن:

– گەیشتبووە دوا ساتەکانی، چاوەکانی منی نەدەبینی، بەڵکو ئەو جێیەی دەبینی کە بۆی دەڕۆیشت. لەگەڵ من نا بەڵکو لەگەڵ ئەواندا قسەی دەکرد:

"خوا لەمن خۆشبوو؟! کوڕەکەشم لەوێیە؟ ئەی کچەکەم و مێردەکەم؟" دەتوت لەبەرامبەریدا کەسێك هەیەو قسەی لەگەڵ دەکات. بۆ دواجار سەیری منی کرد و وتی: "گەردنم ئازاد بکە پوورە هاجەر، من دەڕۆم، ئەوا هاتن بە شوێنمدا."

دەمووچاوی ئەوەندە گەشایەوە دەتوت پارچەیەك نوورە. بەردەوام خەریکی زیکری خوا بوو. لە ئاسوودەییەکی هەمیشەییدا چاوی لێکنا.

دووبارە لەگەڵ پوورە هاجەر باوەشمان کردەوە بە یەکدا... ئەوەندە خراپ پەلەقاژەم دەکرد خەریك بوو خۆمم دەکوشت. ئەویش وەك دایکێکی بەبەزەیی دڵی دەدامەوە. بۆ چەند کاژێرێك لەسەر سفرەکە فرمێسکمان ڕشت. هەموو خەم و پەژارەکانم لەگەڵ ئەودا لەبیرکردبوو. دەتوت یەکەمجارە ئاوا دڵم ئیسراحەت دەکات. قۆڵمی ڕاکێشا:

– وەرە کچم جێگاکەی خۆمم ئامادەکردووە. کەمێك پشووبدە.

بەزۆر بردمیە ژوورەکەی خۆی، ژوورێکی تا بڵێی خۆش و پاك و خاوێن...

چۆن دەمتوانی لەو جێیەدا بخەوم. کەسێك کە ناموسی خۆی دۆڕاند بوو چۆن دەیتوانی لە جێیەکی وەهادا بنوێت کە هیچ تاوانێکی تێدا

نەکراوە؟ هەرگیز مافی ئەوەم نەبوو ئەو جێیە پیس بکەم. کە ئەو چووە دەرەوە لەسەر زەوییەکە پاڵکەوتم و ئاگام لە خۆم نەما. کاتێك چاوم کردەوە حەسابوومەوە. وەك ئەوەی دووبارە گیان هاتبێتەوە ناو جەستەم. چەند کاژێرێك نووستبووم. نزیکی نیوەشەو بوو کە هەستام...

– پوورە هاجەر من زۆر مامەوە. دەبێت بڕۆم هاوڕێکانم چاوەڕێمن.

بەمشێوە چەند درۆیەکم ڕێکخست، ڕاستییەکەی نەمدەویست ماڵەکە بە منەوە پیس ببێت. نەدەبوو کەسێکی وەك من لەو ماڵەدا بمێنێتەوە. بەڵام وەڵامی دامەوە:

– جا چۆن شتی وا دەبێت؟ بە هیچ شێوەیەك ناهێڵم بڕۆیت. تۆ یادگاری دایکتیت لای من. با ڕۆژ ببێتەوە ئەمانە هەمووی باس دەکەین...

هەرچی هەوڵم داو درۆم پێکەوە نا نەمتوانی لە دەستی دەرباز ببم.

## تۆ نەبویتایە من چیم دەکرد

لەوێ مامەوە، تا بەیانی دەردەدڵمان لەگەڵ یەکتر کرد، بەڵام نەمدەویست باسی ئەو هەموو تاوانانە بکەم کە کردوومن، گوایە خۆم دەدزیەوە. ئەو لە هەموو شتێك تێدەگەیشت، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی نەدەدا کە بزانم تێگەیشتووە.

مێردەکەی (مامە ڕەحمی) کۆچی دوایی کردبوو. لە هەمان کاتدا دایکی هاوڕێی منداڵیم (شەیدا) واتە کچەکەی پوورە هاجەر گەڕابوویەوە بەردەم بارەگای خوا. شەیدا لەگەڵ باوکی(مامە یوسف) دەمایەوە. جگە لەوەش شەیدا دەزگیراندار بوو، هاوسەرێتی لەگەڵ دادوەرێکدا کردبوو، بەو نزیکانەش زەماوەندیان دەکرد.

چوو وێنەی شەیدای بۆ هێنام و بۆی باسکردم:

– ئەوان ئێستا لەگەڵ باوکی لە قاتی سەرەوە دەژین.

وێنەکەی پیشاندام، گەورەبووبوو، کچێکی گەنجی باڵاپۆشی زۆر جوان بوو. واتە دوای ئەوەی من ڕۆیشتووم زۆر شت گۆڕاوە. من چۆن گۆڕابووم ئەوانیش گۆڕابوون. بەڵام بە جیاوازییەکەوە، ئەوان پێگەیشتبوون بەڵام من دۆڕابووم.

## نەیهێشت بڕۆم

پوورە هاجەر دوو ڕۆژ نەیهێشت بڕۆم. ئەو دوو ڕۆژە وەك شیفایەکی چەند ساڵە وابوو بۆ من.

کۆتا ڕۆژیش شەیدا هات. باوەشمان کرد بەیەکدا و حەسرەتی ئەو ماوە دوورییەمان دەرکرد. ئەو زۆر شتی هەبوو بۆ باسکردن، بەڵام من هیچ نەبوو باسی بکەم. بەردەوام ئەو قسەی دەکرد و من گوێم دەگرت... باسی مرۆڤی دەکرد، بۆچی دروستکراوین. مردن، ڕۆژی دوایی، لێپرسینەوە...

بەلای منەوە ئەو باسانە لە ڕابردوودا بەجێ مابوون. ئەو ژیانەی تیایدابووم بچووکترین شوێنەواری ئەو چەمکانەی لە مندا نەهێشتبوو. بەتەواوی کەوتبوومە ناو بازنەی بێبڕوایی و نکوڵی کردن. مێشکم چەندین پرسیار و کێشەی تێدابوو:

– ئەمشەو دەزگیرانەکەم، (ئەرکوت) دێت، هەم یەکتر دەناسن، هەم ئەم پرسیارانەش لەو دەکەیت. ئەو کەسێکە زۆر باش خۆی پەروەردە کردووە. دڵنیام زۆر خۆشحاڵ دەبێت بە ناسینت.

منیش قبوڵم کرد.

ئێوارە لەگەڵ دەستگیرانەکەیدا یەکترمان ناسی. کوڕێکی باڵابەرز و ڕووخسار ڕۆشن بوو، ڕێك و پێکی ئەو کوڕە لە حاڵیدا دیاربوو. زۆر باش خۆی پەروەردە کردبوو.

# بەشی پێنجەم

خوای گەورە منی لە لەناوچوون گێڕایەوە.
موعجیزەیەکی وای دروستکرد وات دەزانی سێڤدای
پێشووی سڕیوەتەوەو دانەیەکی تازەی دروست
کردووە. ئەو کەش و هەوایە، ئەو قسە ئاسایانەی
دەیکرد ئەوەندە جوانبوون ناتوانم باسیان بکەم.
ئەوە وردە وردە زیندووبوونەوە بوو بۆ من



# ئەو ڕۆژەی ژیانمی گۆڕی



**ئایا دەکرێت مرۆڤ بێ هوودە بژی؟**

شەو لە ماڵی پوورە هاجەر گفتوگۆیەکی زۆر سەرنجڕاکێش هاتەکایەوە. من پرسیارم دەکرد و کاك ئەرکوت بە شێوازێکی شیرین و لۆژیکی وەڵامی دەدایەوە.

من لە ڕوانگەی بیری خۆمەوە چوومە ناو بابەتەکەوەو وتم:

– بەڕای من بیرۆکەکانی وەك خودا و ئایین، زۆر لەدوا بەجێماوە و عەقڵ و ڕاستییە زانستیەکان جێیان گرتوونەتەوە. مرۆڤ دەبێت چۆن دڵی خۆشە وا ڕەفتار بکات و بژی.

لەڕاستیدا ئەم بیروباوەڕە دەرئەنجامی ئەو ژیانە نوێیەم بوو. هێشتا بۆ تێگەیشتنی کۆمەڵێك ڕاستی بەهانەم دەهێنایەوە، بەڵام وەڵامەکەی کاك ئەرکوت بۆ پرسیارەکەم زۆر ناوازە بوو:

– لەوانەیە بیرۆکەکەتان بەڕای خۆتان ڕاست بێت، بەڵام وەرە با بەیەکەوە سەیری ڕوویەکی تری مەسەلەکە بکەین! دڵنیام کە کۆمەڵە ڕاستییەکی تریش هەن کە ناچار دەبیت قبوڵیان بکەیت.

کتێبێکی گەورەی بەرگ سووری گرت بە دەستییەوە. چەند بەشێکی جیاوازی لە کتێبەکە خوێندەوە و هەم ڕوونیشی کردەوە.

مەسەلەکە بە چیرۆکێکی زۆر کاریگەر دەستی پێدەکرد:

" لە دێر زەماندا، دوو برا پێکەوە چوون بۆ گەشتێکی دوور و درێژ.. ئەم دوو برایە ڕێیان گرتەبەر تا گەیشتنە دووڕیانێك، لەوێدا پیاوێکی هەڵکەوتوو و دامەزراویان بینی ئەمانیش لێیان پرسی:

– ئایا ئەم دوو ڕێگایە کامیان باشترە؟

ئەویش وتی:

– ڕێگای دەستە ڕاست، پەیڕەویکردنی ناچاریی یاسا و ڕێسای تێدایە، بەڵام ئەو پەیڕەویکردنە ئاسایش و کامەرانیی بۆ ئەوانە تێدایە کە دەیگرنەبەر. ڕێگای دەستە چەپیش بێیاسایی و بەرەڵایی و سەربەستیی تێدایە، بەڵام لە دووتوێی ئەو سەربەستییە ڕواڵەتییەدا ڕێڕەوانی ئەو ڕێیە دووچاری فەوتان و بەدبەختی دەبن.. ئێستاش خۆتان لە هەڵبژاردنی هەرکام لەو دوو ڕێگایەدا سەرپشك و سەربەستن.

پاش بیستنی ئەم وتە جوانانە، ڕەوشت باشەکەیان، کە پڕ بەدڵ حەزی لەپەیڕەوی کردنی یاساو ڕێساو ڕێکو پێکی بوو، ڕێگای ڕاستی گرتەبەرو، وتی: (توکلت علی الله) کەوتە ڕێ.. بەڵام بێچارە بەدڕەوشتەکەیان، ڕێگای چەپی بە باشتر زانی، لەبەر حەزو ئارەزووی بەرەڵایی و سەربەستی کە لەو ڕێگایەدا هەبوو..

دەبا ئێمەش بە ئەندێشە و خەیاڵ شوێن پێی ئەم پیاوەیان هەڵبگرین کە ڕێگایەکی بە ڕواڵەت سووك و ئاسانی گرتەبەر، ئەو ڕێگایەی کە لە

ڕاستیدا تا بڵێی زەحمەت و دەردیسەری و ماندووبوونی لە دووتویّدایە، تاکو بزانین چیی بەسەر دێت.

ئەم پیاوە، پاش ئەوەی شیو و دۆڵە قووڵ و بەرزاییە سەختەکانی ڕێگای بڕی، گەیشتە دەشت و بیابانێکی سامناک. لە ناکاودا دەنگێکی ترسناکی بیست، کە ئاوڕێکی لێ دایەوە شێرێکی گەورەی بینی کە لەناو جەنگەڵێکەوە بەرەو ڕووی دەهات! یەکسەر بە ترس و لەرزەوە لەبەری هەڵهات، تا گەیشتە لێواری بیرێکی وشک کە بە ئەندازەی شەست گەز قووڵ بوو. لە ناچاریدا خۆی هاویشتە ناو بیرەکەوە بۆ ئەوەی لە دەست ئەو شێرە ڕزگاری بێت. لە کاتی بازدان و پێش ئەوەی بگاتە بنکی بیرەکە دەستی لە درەختێك گیربوو کە بە دوو لق ڕەگەوە لە دیواری بیرەکەدا ڕوابوو، یەکسەر خۆی پێوە ڕاگیر کرد. هەر هێندەی کە بە درەختەکەوە گیرسایەوە و دەوروبەری خۆی بە باشی بینی، سەیری کرد دوو مشك، یەکێکیان ڕەش و ئەوی تریان سپی، بەردەوام بە دانە تیژەکانیان و لەسەرخۆ خەریکی قرتاندنی ئەو دوو ڕەگەی درەختەکە بوون!

پاشان سەیرێکی سەرەوەی کرد، بینیی وا شێرەکە وەك پاسەوان لە دەمی بیرەکەدا ڕاوەستاوە.. کە سەیری خوارەوەشی کرد هەژدیهایەکی گەورەی لە بنکی بیرەکەدا بینی کە لە نزیکەی سی گەز دوورییەوە سەری هەڵبڕیبوو دەیویست لێی نزیك ببێتەوە و، دەمیشی بە فراوانیی بیرەکە کردبووەوە و چاوەڕوانی ئەو ساتەی دەکرد کە ئەم بەربببێتەوە و ئەویش قووتی بدات! سەرەڕای ئەمانە، چەندین مێرووی گەزندە و ژەهراویی جۆراوجۆریش وەك بازنەی دەست دەوریان لێدا.

پاشان سەیری لای سەرەوەی درەختەکەی کرد، بینیی ئەم درەختە لە ڕواڵەتدا درەختی هەنجیرە، کەچی بە شێوەیەکی دەراسا گەلێك جۆری جیاجیای میوەی وەك گوێز و هەنار و شتی تری لەو جۆرەی گرتووە!

ئەم پیاوەش، بەهۆی تێنەگەیشتن و نەفامیی خۆی، نەیدەزانی کە ئەم شتانەی دەیانبینێت ئاسایی نین و، هەرگیز ناگونجێت بە ڕێکەوت و بێمەبەست هاتبنە کایەوە و، لەوە تێنەدەگەیشت کە ئەم کاروبارە سەیرانە هۆکارێکیان هەیە و دەبێت لە پشتی ئەم شتانەوە یەکێك هەبێت بەڕێوەیان ببات و ڕێکیان بخات..

لەگەڵ ئەمانەشدا، دەروونی بەدخوازی ئەم کابرایە، وەك بڵێیت هیچ شتێك ڕووی نەدابێت و هیچ گیروگرفتێکیش تووشی "دڵ" و "گیان" و "ژیری"ی ئەو نەبووبێت، هەموو ئەوانەی فەرامۆش کرد و پەلاماری میوەی درەختەکەی دا و بێ سێودوو دەستی دایە خواردنی ئەو بەروبوومانە، هەرچەندەش هەندێکیان ژەهراوی و کوشندە بوون. ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەی گوێی خۆی لەتاو هاوار و ناڵەی "دڵ"ی بناخنێت و، دەنگی داد و فریادی دڵ و گیان و ژیریی نەبیستێت!

بەم چەشنە، کەوتە ناو ئاگری سزا و ئازارەوە، نە ئەوە بوو بمرێت و لەو ئازار و سزایە ڕزگاری ببێت، نە دەیشیتوانی ژیانی بە شادمانی بەسەر بەرێت!

وا ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە ئەو نەگبەتە بەجێدەهێڵین، با لە سزا و ئازاری خۆیدا بتلێتەوە و، بە ڕێگای خۆماندا دەگەڕێینەوە تاکو بزانین براکەی چیی بەسەر هات؟

ئەمیش، وەك براكەی، ڕێی كەوتە ناو بیابانێكی بەرین و دەشتاییەكی فراوانەوە. هەروەكو ئەویش، لە ناكاودا دەنگی شێرێكی بیست كە هەڵمەتی بۆ دەهێنا، ئەمیش، وەك براكەی، ترس و بیم دای گرت و سامی لێ نیشت، بەڵام كەمتر لە چاو ترس و سامی براكەی، چونكە بەهۆی بیركردنەوەی جوان و گومانی پاكی، بە جوانی بیریكردەوە و لەبەر خۆیەوە وتی:

– (دیارە ئەم بیابانە فەرمانڕەوایەكی هەیە. كەواتە دەبێت ئەو شێرە خزمەتگوزارێكی گوێڕایەڵی ژێر دەستی ئەو فەرمانڕەوایە بێت).

بەمە دڵنیایی ڕووی تێكرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دەست شێرەكە هەڵهات و ڕایكرد، تا گەیشتە لێواری بیرێكی وشك كە شەست گەز قووڵ بوو. ئەمیش، وەك براكەی، لە ترسی شێرەكە خۆی هاویشتە ناو بیرەكەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە بنكی بیرەكە دەستی لە درەختێك گیر بوو، یەكسەر خۆی پێدا هەڵواسی. سەیری كرد وا دوو زیندەوەر پەیتا پەیتا هەردوو لقی ڕەگی درەختەكەیان دەقرتاند.. پاشان كە سەیری سەرەوەی كرد، شێرەكەی بینی كە لە دەمی بیرەكەدا ڕاوەستابوو.. ئنجا سەیری خوارەوەی كرد هەژدیهایەكی لە بنكی بیرەكەدا بینی.. كە سەیری خۆیكرد بینیی لە بارێكی سەیر و سەرسووڕهێنەردایە و، گەلێك ڕاما، بەڵام سەدان جار لە ڕامانی براكەی كەمتر، چونكە ڕەوشتە جوانەكانی بیركردنەوەی جوانیان پێبەخشیبوو، كە ئەمەش لایەنە جوانەكانی هەموو شتێكی پیشان دەدا..

لەبــەر ئەمــە، بــیری کــردەوە کــە ئــەم شــتە سەرســووڕهێنەرانە پەیوەنــدییان لەگــەڵ یــەکتردا هەیــە و، وا دەردەکــەوێت کــە یــەکێك هەیــە بیانبزوێنێت و، دەبێت ئەم کاروبارە سەرسووڕهێنەرانە نهێنییەکی شـاراوە و تەلیسمێکی داخراویان تێدا بێت:

– (بەڵێ، هــەموو ئــەم شـتانە دەگەڕێنــەوە بـۆ فــەرمانی فەرمانڕەوایـەکی نادیار، کەواتە من لێرەدا تەنیا و ئاوارە نیم، بەڵکو ئەو فەرمانڕەوا نادیارە دەمبینێت و پارێزگاریم دەکات و، بۆ ئەنجام و مەبەستێکی تایبەتی تـاقیم دەکاتەوە و، بۆ کوێ بیەوێت دەمبات)!

لەم بیرکردنەوە جوانەدا شەوق و تاسەیەکی تێدا پەیدا بـوو کـە ئـەم پرسیارەی هێنایە کایەوە:

– ئایـا دەبێـت ئـەو کەسـە کـێ بێـت کـە بـەم جـۆرە تـاقیم دەکاتـەوە و دەیەوێت خۆیم پێ بناسێنێت و لـەم ڕێبـازە سـەیرەوە بـەرەو ئـەنجامێکی دیاریکراو ئاراستەم بکات؟!

خۆشەویستیی خاوەنی تەلیسمەکە لە حەزکردنی ناسـینیەوە دروسـت بوو.. لەو خۆشەویستییەشەوە حەزی شیکردنەوەی ئەو تەلیسمە گەشـەی کـرد.. لـەم حەزەیشـەوە ئـارەزووی وەرگرتنـی بـارێکی شـیاوی گونجـاو بەرامبەر خاوەنی ئـەو تەلیسـمە و بـۆ دەسـتکەوتنی ڕەزامەنـدیی ئـەو، لـە دەروونیدا پەیدا بوو..

پاشـان سـەری هـەڵبڕی و سـەیرێکی درەختەکـەی کـرد، بینیـی ئـەم درەختە بە ڕواڵەت دار هەنجیرە، کەچی هەزاران جۆر میوەی ڕەنگاوڕەنگی گرتووە! هەر کە ئەمەی بینی یەکسـەر ترسـەکەی بـە تـەواوی ڕەوییـەوە.

چونکه بۆی ڕوون بووەوە کە ئەم دارهەنجیرە لیستە و پێڕست و پیشانگایەکە فەرمانڕەوای نادیار، بەو شێوە سەیرە، نموونەی پێکهاتووەکانی ڕەزو باخچەکانی خۆی لێرەدا داناوە و ئەم درەختەی پێ ڕازاندووەتەوە بۆ پیشاندان و دەرخستنی ئەو لەزەت و خۆشییانەی کە لە باخچەکانیدا بۆ میوانەکانی خۆی ئامادەی کردوون. ئەگەر نا درەختێك هەرگیز بەروبوومی هەزاران درەخت ناگرێتە خۆ..

ئیتر ئەم مرۆڤە کە گەیشتە ئەم ئەنجامە، هیچی بۆ نەمایەوە لە نزا و پاڕانەوە زیاتر، بۆیە بە سەرکزی و ملکەچی یەوە ئەوەندە پاڕایەوە تا کلیلی نهێنییەکەی کەوتە دڵەوەو وتی:

– "ئەی فەرمانڕەوای ئەم هەرد و دەشت و بیابانە! وا پەنام بۆ هێنایت و لێت دەپاڕێمەوە، من خزمەتگوزارێکی تۆم و، تەنها ڕەزامەندیی تۆم دەوێت، داوات دەکەم و لە دووت دەگەڕێم".

پاش ئەم پاڕانەوەیە، یەکسەر دیواری بیرەکە لە شێوەی دەرگایەکدا لەسەر سەوزایی و باخچەیەکی فراوانی جوان و بێگەرد کرایەوە. دوور نییە هەر دەمی هەژدیهاکە بووبێت بە دەرگا و لێی خرابێتە سەرپشت..

شێر و هەژدیهاکەش وەك دوو خزمەتگوزاریان لێهات و خوڵکیان دەکرد بۆ ناو باخچەکە، تەنانەت شێرەکە لەبەر دەستیدا شێوەی ئەسپێکی ئامادە و زینکراوی وەرگرت.

ئەو دوو برایە، یەکێکیان: "ڕۆح"ی ئیماندار و "دڵ"ی پیاوچاکە.. ئەوی تریان: "ڕۆح"ی کافر و "دڵ"ی مرۆڤی فاسقە..

ڕێگای لای ڕاستیان: ڕێبازی قورئان و شاڕێگای ئیمانە.. ڕێگـای لای چەپیش: ڕێبازی کوفر و یاخیبوونە..

ئەو باخ و بێستانەی سەر ڕێگاکەش: ئەم ژیانە کۆمەڵایەتی و کاتیـەی کۆمەڵی مرۆڤایەتی و شارستانێتیی ئادەمیزادە، کە لـە یـەك کاتـدا بـاش و خراپ، خێر و شەڕ، پاك و پیسی تێدایە..

ئەو بیابانەش: ئەم دنیا و سەرزەوییەی خۆمانە کە تیایدا دەژیین..

ئەو شێرەش: مردن و ئەجەلی مرۆڤە..

ئەو بیرەش: لەش و جەستەی ئادەمیزاد و سەردەم و کاتی ژیانیەتی

قووڵییە شەست گەزییەکەی بیرەکەش: ئاماژەیە بۆ تێکڕای تەمەن کە شەست ساڵە..

ئەو درەختەش: ماوەی تەمەن و ماددەی ژیانی ئادەمیزادە..

ئـەو دوو گیانلەبـەرە ڕەش و سـپییەش: شـەو و ڕۆژن لـە تەمـەنی مرۆڤدا..

مەبەست لە دەمی هەژدیهاکـەش: دەمـی "گۆڕ"ە کـە دەرگایەکـە لـە ڕووی بەرزەخ[1] و ژیانی ئاخیرەتدا دەکرێتەوە، ئەوەندە هەیە کە ئەو دەمـە بۆ مرۆڤی باوەڕدار دەرگایەکە پیایدا تێپەڕ دەبێت، کاتێك لـە بەندیخانـەی دنیاوە بـەرەو باخچـە و بێستانەکانی بەهەشتی بـەرین دەڕوات و هـەنگاو دەنێت..

ئـەو مێـرووە زیانبەخشـانەش: گیروگرفـت و بـەڵاکـانی ژیـانی دنیـان. ئەوەنـدە هەیـە بـۆ مرۆڤـی بـاوەڕدار هۆکـارێکی شـیرینی بێدارکردنـەوەی

---

[1]- بەرزەخ: ژیانی ناو گۆڕ.

خواوەندن و، ئاوڕدانەوەی پەروەردگارن لە بەندەکانی خۆی، تا هەرگیز "بێ ئاگایی" بە سەریاندا زاڵ نەبێت..

بەروبوومە هەمە چەشنەکانی ئەو درەختەش: نیعمەتەکانی دنیان کە پەروەردگاری گەورە و سەخاوەتمەند دروستی کردوون، بۆ ئەوەی وەك لیستە و ناوەرۆکێك وابن بۆ نیعمەتەکانی ئاخیرەت و یادی نیعمەتەکانی ئەوێیان پێ بکرێتەوە و، خواوەندی دانا بۆ بانگێشتی کڕیارەکانی میوەی بەهەشت لە شێوەی چەند نموونەیەکدا بەدیی هێناون.

ئەو هەموو میوە جۆراوجۆرانەش کە خوا بەو درەختەی بەخشیبوو، پەنجە بۆ مۆرکی "صەمەدانییەت"ی خوا و تەمغەی[1] "پەروەردگارێتی" و فەرمانڕەوایەتی "دەستەڵاتی" ئەو درێژ دەکات..

چونکە (دروستکردنی هەموو شتێك لە تەنیا یەك شت) وەك پێکهێنانی هەموو جۆرەکانی ڕووەك و بەروبوومەکانیان لە تەنها یەك گڵ و، دروستکردنی هەموو زیندەوەران لە یەك ئاو و، داهێنانی ئامێرەکانی زیندەوەرانیش لە خۆراکێکی ساکار.. هەروەها (دروستکردنی یەك شت لە هەموو شتێك) وەك دروستکردنی گۆشتێکی تایبەتی و پێستێکی ئاسایی بۆ زیندەوەران لە چەندین جۆر خۆراکی هەمە چەشن و جیاواز.. هەموو ئەمانە سکە و تەمغەی کەسێکی "صەمەد" و تاك و تەنیا و، مۆری تایبەتیی پادشای ئەزەل و هەتاهەتایین کە هەرگیز بە کەس لاسایی ناکرێنەوە.

---

[1] – تەمغە: مۆری دەزگای دەوڵەتی.

بەڵێ، داهێنانی یەك شت لە هەموو شتێك و، بەدیهێنانی هەموو شتێکیش لە تەنیا شتێك، تایبەتکارییەکی سەربەخۆی بەدیهێنەری هەموو ئەو شتانەیە و، بەڵگەیەکی تایبەتیی ئەو خواوەندەیە کە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانا و زاڵ و بەدەستەڵاتە.

ئەو تەلیسمەش، نهێنیی دانست و ئامانجی بەدیهاتنی بوونەوەرانە، کە تەنها بەهۆی نهێنیی ئیمانەوە دەکرێتەوە.

ئەو کلیلەش کە دەیکاتەوە( الله لا إله إلا هو الحي القيوم)و (يا الله) و (لاإله إلا الله)یە.

گۆڕانی دەمی هەژدیهاکە و بوونی بە دەرگای باخچە و بێستان، هێمای ئەوەیە کە: "گۆڕ" بەندیخانەی دڵتەنگی و لەبیرچوون و فەرامۆش کردنە و، بۆ گومڕایان و ستەمکاران وەکو ناوسکی هەژدیها وایە.. بەڵام بۆ ئەهلی باوەڕ و قورئان دەرگایەکە خراوەتە سەرپشت، تا لە بەندیخانەی ئەم ژیانە بەرەو باخچە و گوڵزارەکانی ژیانی نەمری و هەمیشەیی و، لە گۆڕی تاقیکردنەوەی دنیاوە بۆ خۆشی و کامەرانیی بەهەشت و، لە دەردیسەریی ئەرکی ژیانەوە بۆ ژێر سایەی بەخشندەیی خوای گەورەی میهرەبان دەرباز ببن.

گۆڕان و بوونی ئەو شێرە دڕندەیەش بە ئەسپێکی ئامادەکراوی خزمەتگوزار، هێمایە بۆ ئەوەی کە: "مردن" بۆ گومڕایان جودایی و لێکدابڕانێکی سزادەری هەتا هەتاییە لە هەموو دۆست و خۆشەویستان و، بەجێهێشتنی بەهەشتێکی درۆینە و هەڵخەڵەتێنەری وەك دنیایە، بۆ ناو تەنگی و تەسکیی بەندیخانەی تەنیایی ناو گۆڕ و ونبوون و

سەرلــێشێوانێکی بێســنوور.. بــەڵام بــۆ ئــەهلی هیــدایەت و قورئــان، گەشتێکە بەرەو جیهانی دوایی و هۆکارێکی گەیشتنە بـە خۆشەویستان و هاوڕێیـانی دێـرین و، هۆیەکـە بـۆ چـوونە نـاو نیشـتمانی ڕاسـتەقینە و بەختیاریی هەمیشەیی و، خولك و بانگکردنێکی بەڕێزانەیە بۆ دەربـازبوون لـە بەندیخانـەی دنیـا بـەرەو باخچـەکانی بەهەشـت و، چـاوەڕوانیەکە بـۆ وەرگرتنــی پاداشــتی خزمەتگوزارییــەکان لــە لایــەن میهرەبــانیی خــوای گــەورەوە و، حەوانەوەیەکــە لــە ئــەرك و لــێپرسراوییەکانی ژیــان و پشـوودانێکە لـە فەرمانبەرییـەکانی و، ڕاگەیاندنێکـە بـۆ کۆتـایی هـاتنی ئەرکەکانی بەندایەتی و تاقیکردنەوەکانی فێربوون لەم ژیانەی دنیادا.

هەرکەسێك ژیانی دنیای فانی بکات بە ئامانج و مەبەستی خۆی، ئـەوا هـەر ئـەم ژیانـەی (لـە ڕاسـتی و ناوەڕۆکـدا) بـۆ دەبێـت بـە دۆزەخێکـی دڵسووتێنەر، با لە ڕواڵەتیشدا لە ڕابواردن و نـاز و نیعمەتـدا بێـت.. بـەڵام ئەو کەسەی ڕوو بکاتە ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەی ئەو دنیا و بـە ڕاسـتی و دڵسۆزی تێبکۆشێت و هەوڵی بۆ بدات و بۆی لـێ ببڕێت، ئەوا کامەرانی و بەختیاریی هەردوو لای دەستگیر دەبێت و شایانی هەردووکیان دەبێت، با ئـەم دنیایەشـی لـە ڕواڵەتـدا تـەنگ و خـراپ و نـاخۆش بێـت، بـەڵام ئـەم بەلایــەوە خــۆش و شــیرین دەبێــت و لەبــەر چــاویدا دەبێــت بــە هــۆڵی چاوەڕوانیی بەهەشـتی بـەرین. لەبەرئـەوە، ئـارام دەگرێـت و هەمیشـە لـە سوپاسگوزاری پەروەردگاری خۆیدا دەبێت."[1].

١- وتـەکان، "وتـەی هەشـتەم"، لـە نووسـینی بـەدیعوززمان (سـەعیدی نوورسـی)یە (فاڕووق ڕەسول یەحیا) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

مرۆڤ پێویستە ئەم پرسیارانە لە خۆی بکات:

ئەو زاتەی کائیناتی بەم نەخشەو پلانە جوانە دروست کردووە، زاتێك کە نیعمەتانێکی بێئەندازی پێشکەش بە مرۆڤەکان کردووە ئایا گونجاوە هەموو ئەمانە پشتگوێ بخات و مرۆڤ بێ لێپرسینەوە و بەبێ هۆ بەجێ بهێڵێت؟

ئایا وادەزانیت ستەمکارو ستەملێکراو، ڕاست و درۆ، بەئابڕوو و بێئابڕوو هەمووی تێکەڵ بەیەك دەبن و لێپرسینەوەیان لەتەکدا ناکرێت.

هەرکەسێك عەقڵی لەسەردا بێت یەکسەر وەڵامی ئەم پرسیارانە بە نەخێر دەداتەوە.

منیش هەر وەڵامی نەخێرم دەدایەوە، بەڵام مێشکم تێکچووبوو بەسەر یەکدا.

لە بەرامبەر ئەم وەڵامە جوانەدا پرسیارێکی لەم شێوەیەم پرسی:

– ئەگەر خوا هەیە با ئێمەی لێئاگادار بکاتەوە، خۆیمان پێ بناسێنێت. بابیناسین و خۆشمان بوێت. با ناچار نەبین بە دوایدا بگەڕێین.

ئەویش لە کتێبەکەی بەردەستیدا لاپەڕەیەکی کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوە:

– هەموو دروستکراوەکان بەڵگەی ڕوون و ئاشکران لەسەر خالقیەتی خوای گەورە، تەنها ئەوەیە کە ئێمە هۆشیارانە وردنابینەوە یان نامانەوێت ئەو ڕاستیانە ببیستین.

بیربکەنەوە... "هەروەك شووشەدەرمان و پێکهاتەیەکی کیمیایی ناو دەرمانخانەیەکی گەورە، کە بەچەندین تەرازووی سەرنەکەر و ئەندازەی

ورد ئاوێتـەی یـەکتر کـرابێتن، دەیچەسـپێنێت کـە دەرمـانگرێکی دانـاو کیمیاگەرێکی زانا ئەم کارانەی ئەنجامـداوە. دەرمانخانـەی گۆی زەویـش، کـە چوارسـەد هـەزار جـۆری ڕووەك و زینـدەوەری زیـاتر تێدایـە بەهـەمان جـۆرە... چـونکە لـە ڕاسـتیدا هەریەکـە لـەو ڕووەك و زیندەوەرانـە وەك شووشـەیەکی پـڕ لـە پێکهـاتووی ورد و، ئاوێتـەکراوێکی زینـدەکاری سەرسوڕهێنەر وایە.

جـا ئـەم دەرمانخانـە گەورەیـە خواوەنـدی دانـاو شـکۆمەند پیشـانی هەموو کەسێك، تەنانەت کوێرەکانیش دەدات و، بە ئەندازەی پلەی کـەماڵ و ڕێکوپێکی و گەورەییەکـەی، بەدیهێنـەری بەخشـندە بـە جگـە لـە خـۆی دەناسـێنێت. بـە چەشـنی دەرمانخانەکـەی بـازاڕ. کـە کیمیاگـەر و دروستکەری خۆی ناساند.

هەروەك ئەگەر کارگەیەکی گەورە و نائاسایی لە تـەنها مادەیـەکی زۆر ساکار چەندین جۆر کوتاڵی جۆراوجۆر بچنێت و بەرهـەمیان بهێنێـت، ئـەوا بەم کارەی دەیچەسپێنێت کە بـێ هـیچ گومانێـك ئەنـدازیارێکی میکـانیکی کارامـە هەیـە ئـەم کارانـە ڕادەپـەڕێنێت. بـەم جـۆرە ئـەو کارگەیـە ئەندازیارەکەیمان پـێ دەناسێنێت.

هـەروەك کۆگـاو گەنجینەیـەکی گـەورەی ئازووقـە، کـە لـە هـەموو لایەکـەوە هـەزاران جـۆر خواردەمـەنی تێـدا ئامادەکرابێـت و لەیـەك جیاکرابنـەوە هەریەکـەیان لـە جێگایـەکی تایبەتیـدا ڕیزکـرابن. تێمـان دەگەیەنێت کە خاوەن و بەڕێوەبەرێکی هەیە سەرپەرشتی دەکات.

ئەم گەنجینە ڕۆزیدانە خواییەش بەهەمان شێوەیە..

ئەم گەنجینەیەی کە لە گەشتی یەك ساڵیدا ماوەی بیست و چوار هەزار ڕێ بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەبڕێت و سەدان هەزار بەدیهێنراوی لەناودا هەن کە هەریەکەیان پێویستی بەجۆرێك خواردەمەنی تایبەتی هەیە...

ئەم گەنجینەیەی کە بەسەر چوار وەرزەکەدا تێپەڕ دەبێت و، وەرزی بەهار وەك کاروانێك کە هەزار جۆر خواردەمەنی پێبێت، لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەو هەموو هەزارانە دەهێنێت کە لە زستاندا خۆراك و ئازووقەیان لێبڕاوە.

یان ئەگەر سوپایەکی گەورە چوارسەد هەزار گەل و نەتەوەی جیاجیای لەژێر ئاڵاکەی خۆیدا کۆکردبێتەوە و هەریەك لەو ڕەگەز و نەتەوانەش خواردەمەنی لەوانی تر جیاواز بێت و، چەکی هیچیان لەوی تریان نەچێت و، بەرگ و پۆشاك و شێوەی مەشقکردن و جۆری تەعلیمات و ماوەی پشوودانیان لەیەکتر جیابێت و، پێشەوای ئەو سوپایە، بێ ئەوەی هیچیانی بیر بچێتەوە و سەری لێ تێك بچێت، خۆراك و پۆشاکی جیاجیایان بداتێ...

ئەو سوپایەی بەم جۆرە بێت دەریدەخات کە: پێشەواکەی کەسێکی بێوێنە و ناوازەیە.

جا هەروەك ئەم سەربازگە سەرسوڕهێنەرە ئەو پێشەوا ناوازەیەمان بۆ دەردەخات و پێمان دەناسێنێت و تەنانەت خۆشەویستیشی دەکات لەلامان، سەربازگەی زەویش بەهەمان جۆرە. چونکە سەربازگەی زەوی لە هەموو بەهارێکدا سەرلەنوێ سوپایەکی خوایی گەورە لە چوارسەد هەزار ڕەگەز و جۆری ڕووەك و نەتەوە جیاجیاکانی زیندەوەران پێك دەهێنێت و، هەرجۆرەشیان پۆشاك و، خۆراك و، چەك و، مەشق و، پشووی تایبەتی

خۆی لەلایەن پێشەوایەکی گەورەی تاك و تەنیاوە، بەبێ لەبیرچوونی هیچکامێکیان، یان لێ تێکچوون، یان سەرگەردان بوون و، بەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکیشەوە، پێی دەبەخشرێت.

یان نموونەیەکی تر ئەگەر کتێبێك هەبێت، لە هەر دێڕێکیدا کتێبێك بە خەتی ورد و لە هەموو وشەیەکیدا سوورەتێکی قورئانی تێدانووسرابێت و هەریەك لەو مەسەلەو بابەتانەش کە لێیان دەدوێت ورد و پڕواتابن و پشتی یەکتری بگرن. بێ هیچ گومانێك، کارامەیی لەڕادەبەدەری نووسەرەکەی و توانستی تەواوی دانەرەکەی دەردەخات.

بەم جۆرە و بەپێی ئەوانەی باسمانکرد، هەریەکە لەو زانستە لەڕادەبەدەر و زۆرانە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری شکۆمەندی بوونەوەر و، خوای گەورەمان بە ناوە جوانەکانی و کەماڵات و سیفەتە بەرزەکانی پێ دەناسێنێت"[1].

نووسەری ئەم کتێبانە، بەدیعوزەمان سەعیدی نوورسی لە کتێبێکی دیکەیدا نموونەیەکی تر بۆ ئەم مەسەلەیە دەهێنێتەوە:

"سەرنج لە هەر دەرمانخانەیەك بدەیت، سەدان شووشەی پڕ لە مادەی کیمیایی جۆراوجۆری تێدا دەبینیت...

هەریەکە لەو مادانە بە پێی تەرازوویەکی دیاریکراو پێکهاتووە و پوختە کراوە. گرامێك لەم دەرمان و سیان لەو دەرمان و دە گرام لەوی تر. بەم جۆرەو لە هەرکام لەو دەرمانانە ئەندازەیەکی تایبەتیان

---

[1]- تیشکەکان، "تیشکی یازدەهەم، مەسەلەی شەشەم"، لە نووسینی بەدیعوززمان (سەعیدی نوورسی)یە (فارووق ڕەسول یەحیا) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

لێوەرگیراوە، بەجۆرێك گەر بهاتایەو بەئەندازەی بەشێك لە یەك گرام زیاتر یان کەمتر بوایە ئەو کاریگەرییەی نەدەماو، زۆرجاریش دەبووە ژەهرێکی کوشندە.

جا ئایا دەچێتە عەقڵی هیچ مرۆڤێکی ژیرەوە کە ئەو هەویرەی بەم جۆرە هەموو بەشێکی بە وردی حساب کراوەو لێك دراوەتەوە، بە هۆی رێکەوتنێکی سەیرەوە پەیدابووبێت؟ یان لە ئەنجامی هەڵکردنی رەشەبایەك شووشەکان بەسەر یەکدا کەوتبن و ئەو ئەندازە دیاریکراوانەی ئاوێتەی یەکتری کردبێت و بەم جۆرە ئەو دەرمانەی پێك هێنابێت.

ئەو مرۆڤەی بەئەندازەی تۆزقاڵێك عەقڵی هەبێت، دەڵێت: من ئەم بیرۆکەیەم قبوڵ نییە !"[1]

ئەم راستییانە یەك یەك بێداریان دەکردمەوە، بەڵام مێشکم ئەوەندە کاس بوو کە بەئاسانی حاڵی نەدەبووم.

## ناتوانم بڕوا بەوە بکەم مردوو زیندوو دەبێتەوە

هەر لەمنداڵیمەوە نەمدەتوانی بڕوا بەوە بهێنم کە مردوو زیندوو دەکرێتەوەو، ئێسکە رزیو و جەستە پەرش و بڵاوەبووەکان دووبارە دەبنەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی.

ئەویش لەوەڵامی ئەوەدا وتی:

---

١- بریسکەکان، "بریسکەی بیست و سێهەم" لە نووسینی بەدیعوززمان (سەعیدی نوورسی)یە (فارووق رەسول یەحیا) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

- سێڤدا خان ئایا دەزانیت، لە سایەی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هیچ مەسەلەیەکی قورس نەماوە باس نەکرێت. تەنها ئەوەندە بەسە کە مرۆڤ بە ئینسافەوە لێیان ورد ببێتەوەو ئینکاری ڕاستییەکان نەکات.

لە وتەی دەیەمدا دەربارەی ئەم مەسەلەیە چیرۆکێکی ئاوا باسکراوە:

" لە گەشتێکدا دوو کەس پێکەوە بۆ وڵاتێکی گەلێك قەشەنگ و تابلۆی جوان و ڕەنگینی وەك بەهەشت ڕۆیشتن (مەبەست لەم لێکچواندنە دنیایە) کە گەیشتنە ئەوێ، سەرنجیان دا: خەڵکی ئەو وڵاتە دەرگای دوکان و خانووەکانیان بە کراوەیی جێهێشتووە و، بایەخ بە چاودێری و پاراستنی خانووبەرە و دوکانەکانیان نادەن و، پارە و پوول و سامانەکانیان بێ هیچ پاسەوانێك و بە ئاشکرا و لەبەر چاو و دەستی خەڵکیدا داناوە..

کە ئەمەیان دی، یەکێکیان - بە هاندانی دەروونی بەدخوازی خۆی - ئەمەی بە هەل زانی و، پەلاماری ئەو کەرەسە و شمەك و پارە و سامانانەی ئەوێی دا و، تاوێك تالانی دەکردن‌و تاوێکی تر چیی بەردەست بکەوتایە دەیدزین.. بەم جۆرە، هەر چەشنە ستەم و خراپکارییەکی پێکرا و لێی وەشایەوە درێغیی لێ نەکرد و، دانیشتووانی وڵاتیش بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدەدا..

هاوڕێکەی پێی وت:

– ئەوە چی دەکەیت؟.. بێگومان تۆ هەر ئاوا ئەم کارانەت بەسەردا تێناپەڕێت و لە ئەنجامدا سزای ئەم ڕەفتارانەت دەچێژیت و، منیش – لەگەڵ خۆتدا – دووچاری چەندین بەڵا و گیروگرفت دەکەیت. ئەم سامانانەی دەیانبینیت، هی دەوڵەتن و، دانیشتووانی وڵاتیش بە خاوخێزانەوە تێکڕا بوون بە سەرباز و کارمەندی دەوڵەت و، بە پۆشاکی میللی(مەدەنی)یەوە لە کار و فەرمانبەرییەکانیاندا خراونەتە کار، هەر لەبەر ئەوەشە کە بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدایت. ئنجا ئەوەش بزانە کە یاسا و ڕێسای ئێرە گەلێك توندوتیژە و، لە هەموو لایەکدا تەلەفۆن و چاودێر و هەواڵدەر و پیاوانی پادشا بڵاو بوونەتەوە، دەسا هەر ئێستا خێراکە و بە پەلە بڕۆ داوای لێبوردن بکە).

بەڵام هاوڕێ گێژ و گەلحۆکەی، نکوڵی کرد و سەرسەختیی نواند و، وتی:

– ئەم سامانانەی دەیانبینیت هەرگیز هی دەوڵەت نین، بەڵکو بێخاوەن و گشتی و هەرەمەکین و، هەموو کەسێك دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی دەستیان بۆ ببات. ئەوەتا من هیچ شتێك نابینم ڕێی سوودوەرگرتنم لەم شتە جوان و ڕەنگینانەی بەردەمم لێ بگرێت.. ئەوەش بزانە کە: جگە لە شتێ بە چاو بیبینم من باوەڕم بە چیی‌تر نی‌یە)! پاشان کەوتە قسەی پڕوپووچی وڕێنەئاسا و فەلسەفەلێدانی ئەم بۆچوونەی خۆی!

ئا لێرەدا گفتوگۆکەی نێوانیان پتر پەرەی سەند و کەوتە دۆخێکی توند و گەرمەوە و، بابای گێلی گەلحۆ لە هاوەڵەکەی زیاتر هاتەپێش و، لێی پرسی:

- ئايا پێمنالێیت پادشا کێیە؟.. من نایناسم!

هاورێکەی وەڵامی دایەوە:

- تۆ گومانت لەو ڕاستییە نییە کە: گوندی بێکوێخا و.. دەرزیی بێوەستا و خاوەن و.. پیتی بێنووسەر نییە و نابێت. ئەی ئایا چۆن ئەوە بە خۆت ڕەوا دەبینیت کە پێتوابێت ئەم وڵاتە ڕێکوپێك و ڕەنگینە بێ پادشا و فەرمانڕەوا بێت؟ یان چۆن ئەم هەموو سەروەت و سامانە بەنرخ و بەهادارانە بێخاوەن دەبن؟ کە ئەوەندە زۆر و زەبەندە و بەردەوامن دەڵێیت لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە شەمەندەفەرێکی پڕ لە ئازووقە و ڕۆزیی بەنرخ دەم بە دەم دێت و بارەکەی لێرەدا ڕۆ دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە و دەڕوات؟ ئایا نابینیت لە هەموو لایەکی ئەم وڵاتەدا ئاگاداری و بەیاننامەکانی پادشا بڵاوکراونەتەوە و، ئاڵاکانی لە هەموو گۆشەیەکدا دەشەکێنەوە و، تەمغە و مۆری تایبەتیی خۆی لەسەر ئەو هەموو کاڵا و سەروەت و سامانانە نەخشێنراوە؟ ئیتر چۆن بە بێ خاوەنیان دادەنێیت؟.. دیارە تۆ شتێك لە زمانی فەرەنگ فێربوویت و توانای خوێندنەوەی ئەم نووسینە ئیسلامییانەت نەماوە و، ناتەوێت لە کەسێکی شارەزاش بپرسیت و داوا بکەیت ئەو نووسینانەت بۆ بخوێنێتەوە! وەرە با من گرنگترینی ئەو فەرمان و بەیاننامانەی پادشات بۆ بخوێنمەوە.

هاورێ سەرسەختەکەی گەڕایەوە و وتی:

- با دان بە بوونی پادشایشدا بنێین.. بەڵام ئایا چ زیانێکی پێ دەگات و چ کەم و کورتی و ناتەواوییەك بە گەنجینەکانیەوە دەردەکەوێت گەر من

بۆ خۆم سوودێکی کەمیان لێ ببینم؟.. پاشان من لێرەدا هیچ بەندیخانە و تۆڵە و سزایەکی هاوچەشنی نابینم کە تۆ باسیان دەکەیت.

هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە:

- برام! ئەم وڵاتەی بەرچاومان - لە ڕاستیدا - بریتییە لە:

گۆڕەپانێکی تاقیکردنەوە و..

مەیدانێکی مەشق و مانۆڕ و..

پێشانگایەك بۆ خستنەڕووی سنعەتە نایابەکانی پادشا و..

میوانخانەیەکی تابلێی کاتی و کەم خایەن.

ئایا نابینیت هەموو ڕۆژێك کاروانێك میوان دێنە ناوی و کاروانێکی تر دەڕۆن و کۆچ دەکەن و، هەمیشە لە میوان پڕ دەکرێت و پاشان خاڵی دەکرێتەوە؟

جا ئەم مەیدانە - لە ئەنجامدا - بە تەواوی و یەکجاری لە میوانەکانی ناوی چۆڵ دەکرێت و دەگۆڕێت بە مەیدانێکی تری نوێی هەمیشەیی و، ئینجا هەموو خەڵکی بۆ ئەوێ دەبرێن و، هەریەکەیان "سزا" یان "پاداشت"ی خۆی لەوێ وەردەگرێت.

هاوڕێ خیانەتکار و سەرلێشێواوەکەی، جارێکی تر لێی هەڵگەڕایەوە و وتی:

- باوەڕم بەم قسانەت نییە! چۆن دەگونجێت ئەم وڵاتە ئاوەدانە لەناو ببرێت و دانیشتووانەکەیشی بۆ وڵاتێکی تر بڕۆن و بگوێزرێنەوە؟

هاوڕێ ئامۆژگار و بیوەی و دڵسۆزەکەی پێی وت:

- مادەم تۆ ئاوا سەرپێچی لە "ڕاستی" دەکەیت و لەسەر بۆچوونی خۆت هەر سوور و بەردەوامیت، ئەوا وەرە با بە کورتی ئەوەندە بەڵگەی لەڕادەبەدەرت بۆ ڕوون بکەمەوە کە هەر هەموویان - بە بێگومانی - بوونی: دادگایەکی یەکجار مەزن و.. خانەیەکی پاداشتدانەوە و.. لانەیەکی تۆڵە و بەندی و سزات بۆ دەچەسپێنن و، دەریدەخەن کە هەروەك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وڵات لە دانیشتووانی خاڵی دەکرێتەوە، هەر بەو جۆرەش ڕۆژێك دێت کە بە یەکجارەکی ئەم خاکەیان لێ چۆڵ دەکرێت و ئەم وڵاتەش بە تەواوی وێران دەبێت .

ئێستا وەرە! با تەماشای بەشێك لە سەرۆکەکانی ئەم فەرمانگە و کۆمەڵانە بکەین. ئەوەتا هەندێکیان دەتوانن ڕاستەوخۆ بە تەلەفۆنی تایبەتی پەیوەندی بە پادشای مەزنەوە بکەن، تەنانەت هەندێك لەو سەرەك فەرمانگەیانە پلەی ئەوەندە بڵند و باڵایە کە بۆ دیوانی حوزووری خاوێن و مەزنی پادشا بەرزبووەتەوە و بانگ کراوە..

سەرنج بدە و بزانە ئەوانە چی دەڵێن؟.. ئەوەتا هەر هەموویان ئەم هەواڵەمان پێ ڕادەگەیەنن کە: "پادشا جێیەکی گەورە و فراوان و ڕەنگینی بۆ پاداشتدانەوەی چاکەکاران و، شوێنێکی تری سامناکی بۆ تۆڵە و سزادانی خراپکاران ئامادە و تەرخانکردووە و، بۆ ئەمەش بەڵێنی تەواو ڕاست و بەهێز بۆ کەسانی چاکەکار و، هەڕەشەو گوڕەشەی یەکجار توند و تیژ ئاڕاستەی بەدڕەفتاران دەکات". دیارە پادشایش گەلێك بەرز و مەزن و بە عیززەتترە لەوەی کە خۆی گرفتاری ڕیسوایی و زەلیلیی بێ پەیمانی بکات. خۆ ئاشکرایشە کە ئەم هەواڵەی هەواڵدەران ڕایانگەیاند

هەواڵێکی ئەوەندە یەك لە دوای یەك و زۆر و پشتگیراوە کە گەیشتووەتە ڕادەی "تەواتور" و هێزی یەکدەنگی و یەکبوون، چونکە هەر هەموو هەواڵدەران پێمان ڕادەگەیەنن کە: بارەگای ئەم دەستەڵاتداری و پادشاییەی کە لێرەدا شوێنەوار و ڕووخسارەکانی دەبینین، لە وڵاتێکی تری گەلێك دووردایە و، کۆشك و خانووبەرەکانی ئەم مەیدانی تاقیکردنەوەیەش تێکڕا کاتین و، لە پاشاندا دەگۆڕدرێن بە چەند کۆشك و تەلارێکی هەمیشەیی و، ئەم زەوییەش لادەبرێت و زەوییەکی تری نوێی لە جێدا دادەنرێت. چونکە دەستەڵاتداری و فەرمانڕەوایی ئەم پادشاییە مەزن و هەمیشەییەی کە لە شوێنەوار و جێکارەکانیەوە مەزنییەکەی دەردەکەوێت، تەنیا لەوەدا نییە کە بەسەر ئەم شتە فانی و لەناوچووانەدا زاڵ و دەستەڵاتدار بێت، بەڵکو بەسەر ئەو شتانەی کە دارای سیفەتی: "مانەوە و کەماڵ و مەزنی"ن، ئەو دەستەڵاتەی هەمیشە هەر زاڵ و بەردەوام و جێگیر دەبێت.

بەڵێ! زیندووبوونەوەی دوای مردن وەك ڕۆژبوونەوەی دوای شەو، و بەهاری دوای زستان بێگومانە![1]"

یان وەك دکتۆر خالوق نورباقی دەڵێت:

"لەوانەیە لە عەقڵەوە دووربێت کە چۆن مادییاتی مرۆڤ دەپارێزرێت و لەدوای مردن دەگەڕێنرێتەوە، بەڵام هەموو تایبەتمەندییە مادییەکانی مرۆڤ دەتوانرێت لە شریتێکی DNA دا بنووسرێت کە چەند ملیار جار لە سەرەدەرزییەك بچووکترە.

---

١- وتەکان: "وتەی دەیەم".

ئەمە ڕاستییەکی زانستییەو بێگومان چەسپاوە. ئەگەر شریتێك لەمانە لەژێر خۆڵدا ئەگەری گەشەکردن و سەرهەڵدانی هەبوایە، دەکرا هەرچی DNA ی مرۆڤەکانە لەوەتەی دونیا هەیە بکرێتە پەرداخێکەوە و فڕێ بدرێتە سەر زەوی، ئەوکاتە دەمانتوانی هەموویان بەیەکەوە زیندوو بکەینەوە.

ڤایرۆسێك بۆ چەندین سەدە لە ژینگەدا دەمێنێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا هیچ سیفەتێکی زیندوێتی تێدا نییە لە دەرەوەی خانەی زیندوو. بەڵام کە بارودۆخێکی گونجاوی بۆ هەڵکەوت چالاکی بۆ دەگەڕێتەوە، باشە ئەگەر ڤایرۆسێك ئاوەها بێت، دەکرێت مرۆڤی مردوو بە فەرمانی خوای گەورە ژیانی بۆ بگەڕێتەوە؟

بەڵێ، ئەو خوایەی هەموو کائیناتی بەبێ ناتەواوی دروستکردووە، بە فەرمانی ببە، ئەو شیفرەیەی هێندەی پەرداخێك چایە دەڕژێتە سەر زەوی و هەموو مرۆڤایەتی زیندوو دەکاتەوە."

ئەمانە کۆمەڵە وەڵامێکی زۆر لۆژیکی و کاریگەر بوون، تازە بەتازە ڕاستی هەندێك شتم بۆ دەردەکەوت.

## ناتوانین هەموو شتێك بە چاو ببینین

یەکێکی تر لەو پرسیارانەم پرسی کە مێشکم پێوەی خەریك کردبوو، ڕاست بوو وەڵامەکەیم کەم تا زۆر لەو شتانەی پێشتر خوێندیەوە وەرگرتبوو، بەڵام بە تەواوی قەناعەتی پێیان نەکردبووم، پرسیارەکەش ئەمە بوو:

– ئێمە ناتوانین نەخوداو، نەفریشتە و، نەجنۆکەو، شەیتان ببینین. بەتایبەتی لە بوونی خودا و فریشتەکاندا لەبەرئەوەی ناتوانین بە چاو بیانبین، زۆر خەڵك دەکەونە گومانەوە و ئینکاری بوونیان دەکەن. چۆن دەتوانین ئەمە ڕوون بکەینەوە؟

کاك ئەرکوت پێش هەموو شتێك بە نموونەیەکی خەندەئامێز وەڵامی دامەوە:

– سێڤدا خان، با بڵێین خواردنێکی خۆش لێدەنێیت، ئەگەر پێمان بڵێیت: "ئادەی وەرن سەیرێکی ئەم خواردنە بکەن بزانن خۆش دەرچووە؟."

ئێمەش بێین و بڵێین: "خاتوو سێڤدا، ئێمە باوەڕ بەوە ناکەین کە بە چاو نەیبینین. بۆ ئەوەی تامی خواردنەکە بکەین دەبێت سەرمان بچەقێنین بەناو خواردنەکەدا، لەوانەیە ئەو کاتە بتوانین بە چاومان تامەکەی ببینین، ئەو کاتە ڕای خۆمان دەڵێین دەربارەی ئەوەی ئایا خۆشە یان نا." چیمان پێ دەڵێیت؟

ئەم وەڵامە خەندە ئامێز و وردە هەموومانی خستە پێکەنین:

– بە دڵنیایەوە وایە، بۆ ئەوەی بزانین تامی خواردنەکە چۆنە، زمان بەکاردەهێنین.

کاك ئەرکوت بەردەوام بوو:

– بە هەمان شێوە، ئەگەر وتمان: "وەرن سەیرێکی ئەم گوڵە بکەن بزانن چەند بۆنی خۆشە" ئەوکاتە بە چاومان نا بەڵکو بە لوتمان بۆنی

دەکەین. کە دەڵێین: "سەیرکەن ئەو مۆسیقایە چەند خۆشە." گوێ لە دەنگەکەی دەگرین.

بۆ ئەوەی لە بوونی خوداو، تاکێتی و قودرەتی خودا و ئەو بابەتە نادیارانەی وەك ئەمە جێی گومانی خەڵکین تێبگەین، نابێت چاومان بەکاربهێنین بەڵکو عەقڵمان دەخەینە کارو بە دووربینی عەقڵ سەیری بابەتەکە دەکەین.

### ئایا فریشتە هەیە؟

دەربارەی ئەم بابەتەش بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی بە چیرۆکێکی زۆر جوان ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە:

"لە گەشتێکدا دوو کەس، کە یەکێکیان: نەزان و دەشتەکی، ئەویتریشیان: شارەزا و خەڵکی شار بوو، پێکەوە بەرەو شارێکی گەورەی وەك ئەستەمبووڵ کەوتنەڕێ، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە ناو شار، لە سووچێکیەوە، ڕێیان کەوتە خانوویەکی بچووك و وەرشەیەکی پیس و چەپەڵ. سەیریان کرد ئەم خانووە پڕە لە کرێکاری ماندوو کە هەریەکەیان سەرگەرمی کاروباری خۆیەتی لەم کارگە سەیر و نامۆیەدا. لە دەرەوە و دەوروپشتی ئەم خانووەشدا چەندین ئاژەڵ و زیندەوەری جیاجیایان بینی کە هەریەکەیان بە گوێرەی پێویستی و مەرجەکانی ژیانی خۆی، دەلەوەڕین، هەندێکیان ڕووەکی دەخوارد و، هەندێکی تر ماسی و... هتد. پاش بینینی ئەمە، سەریان بەرز کردەوە، هەزاران تەلاری ڕازاوە و کۆشکی بەرزیان لە دوورەوە بینی، کە لەنێوان هەریەکە و ئەوانی تردا چەندین گۆڕەپانی گەورە و فراوان هەبوون، بەڵام دانیشتووانی ئەم

کۆشکانە بە چاو نەدەبینران، چ لەبەر دوورییان، چ لەبەر کزیی چاوی ئەمان، یان لەبەر ئەوەی ئەو دانیشتووانە خۆیان دەرنەدەخست و مەرجەکانی ژیانیش، کە لەو کارگە شرۆڵەو بێسەروبەرەیەدا هەیە، لەوێدا نەبوو..

لێرەدا دەشتەکییەکەیان – کە تا ئێستا شاری نەدیبوو – وتی: (ئەو کۆشکانە هیچ گیانلەبەرێکیان تێدا نییە و چۆڵن، چونکە من نایانبینم و هیچ شتێکیش لەو کۆشکانەدا نییە – وەك ئێرە – پەنجە بۆ بوونی ژیان ڕابکێشێت تیایدا). ئیتر بەم جۆرە وڕێنەیە کاڵفامی و نەزانیی خۆی ئاشکرا کرد!

هاوەڵە شارەزا و عاقڵەکەی، بە لەسەرخۆییەیەوە، پێی وت:

(کاکی خۆم! ئایا ئەم خانووە بچووك و کەم نرخە نابینیت کە پڕە لە زیندەوەران؟ ئایا نابینیت ئەوانە یەك بست چۆڵاییان نەهێشتووەتەوە و، یەکێك هەیە هەردەم دەیانگۆڕێت و هیتر دەهێنێت و دەیانخاتە سەر کار؟ باشە ئایا دەگونجێت ئەو تەلارە ڕێکوپێك و کۆشکە ڕازاوە دوورانە کەسیان تێدا نەبێت کە لەگەڵ ئەو دەوروبەرەدا بگونجێت؟.. نەخێر! ئەمە شتێکی مەحاڵە، بەڵکو دەبێت ئەو کۆشکانە پڕ بن لە گیانداری ئەوتۆ کە مەرجەکانی ژیانی خۆیانیان تێدا بێت، بەڵام نەبینینیان لەبەر دووری، یان کزیی چاو، یان لەبەر دەرنەکەوتنیان، هەرگیزاو هەرگیز نابێت بە بەڵگە لەسەر نەبوونیان، چونکە هیچ کاتێك نەبینین و دەرنەکەوتن نەبووە و نابێتە بەڵگە لەسەر "نەبوون"ی هیچ شتێك!)

لەبەر ڕۆشنایی ئەم نموونە ئاشکرا و ئاساییەدا دەتوانین بڵێین:

ئـەم سـەرزەوییەی ئێمـە کـە یەکێکـە لـە قـەبارەکانی ئـەم ئاسمانـە گەورەیە، هەرچەندە لەچاو قەبارەکانی تردا بچووکە، کەچی دەبینین بووە بـە مەڵبەنـدێك بـۆ ژیـانی لەڕادەبـەدەری گیانـدار و خـاوەن هەسـتەکان، تەنانـەت چـەپەڵترین جێگـای زەوی بـووە بـە سەرچـاوە و پیشـانگە و کانگایـەکی گـەورەی بەشـێکی زۆر لـە گیانـدارە ورد و بچـووکەکان.. جـا زەوییـەك کـە بـەم جـۆرە بێـت، دەبێـت بـە حـوکمی ژیـری و پێویسـتی و دڵنیایی بێگومان، ئەم بۆشایییە فراوانەی ئاسمان و، ئەم ئاسمانە خـاوەن بورج و ئەستێرە و هەسـارە گەورانـە، پـڕ بـن لـە گیانـدار و شـتی خـاوەن هەست. قورئـانی پـیرۆز و شـەریعەتی پـاکی ئیسـلام ئـەو خـاوەن گیـان و هەستانە، کە لە ڕووناکی و ئاگر و تاریکی و هەوا و دەنـگ و بـۆن و وتـە و ئەثیر و تەنانەت لە کارەبا و هـەموو شـتە ناسـکو ڕەوانـەکانی تـر دروسـت کراون، ناو دەنێن بە: "مەلائیکەت" و "جان" و "ڕۆحانییەکان"..

ئەوەی دەڵێت ئاسمانەکان بۆشە و مەلائیکەت و ڕۆحانیەکان بوونیـان نییە، جیاوازی نییـە لەگـەڵ ئـەو گێلـە دەشـتەکییەی بـە گەڕەکـە پـیس و چەپەڵەکە بڵێت پڕە و، بە خانووە جوان و تەلارە بەرزەکان بڵێـت چـۆڵ و بەتاڵ."[1]

## ئەگەر مردن نەبووایە، خۆشتر نەدەبوو؟

یەکێکی تر لەو مەسـەلانەی کـە لـە ژیانمدا پێـی قـەڵس دەبم مردنـە. مردن، لەناوچوون، دوورکەوتنەوە لـە خۆشەویسـتان... ئەمانـە ترسـناکن. خوای گەورە بۆ مردنی دروست کردووە؟ مردن نەبووایە باشتر نەدەبوو؟

---

١- وتەکان، "وتەی بیست و نۆیەم".

ئەویش بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە:

– مەترسە سێڤدا خان. مردن تەنیا بۆ ئەم جیهانەیە. مرۆڤ لە ڕاستیدا کە دەمرێت ئیتر دەگات بە نەمری. لەوێ هەتاهەتایە لەگەڵ خۆشەویستانت دەبیت.

چاوەکانم داخست و بەهەموو هەستێکمەوە وتم: "ئینشائەڵڵا..."

کاك ئەرکوت بەردەوام بوو:

"بیری مردن سروشتی مرۆڤەکانی کە مانەوەی هەتا هەتاییان دەوێت، تێکداوە و خستویەتییە لەرزە. نیگای مرۆڤەکان بۆ مردن ساردە، لەبەر ئەوەی وەك جیابوونەوە و کۆتایی هاتن و لەناوچوون دەبینرێت".

لەڕاستیدا مردنیش وەکو ژیان نیعمەتێکە، کوژانەوە و کۆتاییهاتنێکی بێئامانج نییە، بەڵکو سەرەتایەکی پڕ هیوا و ئامانجە.

هەموو مردنێك سەری لە زیندووبوونەوەیەکەوە دەردەچێت، ڕزین و مردنی تۆوێك، بەشێوەیەکی دەرئاسا بە سیستەمێکی نوێوە سەرەتای نەخشێك و ژیانێکی نوێیە. کاتێك تۆو پارچەپارچە دەبێت، گوڵەگەنمەکان بەڕووی ژیاندا پێ دەکەنن.

ئەو بەروبوومە ڕووەکیانەی مرۆڤ دەیخوات، کە لە لقەکانیان دەکرێنەوە دەمرن، بەڵام لە جەستەی مرۆڤدا ژیانێکی بەرزتریان دەستدەکەوێت. ئەگەر بوونەوەرێك لە ئاستی ژیانی ڕووەکدا بمرێت و زیندووبوونەوەی ئاوا بێت. وەك حەزرەتی مەولانا[1] لە شیعرەکەیدا ئاماژەی

---

١– مەبەست لە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمیە، ناوی تەواوی ( محمد محمد حسین بهاء الدين البخلي) لە ٣٠ ئەیلولی ١٢٠٧ لە دێی بەڵخی سەر بە ناوچەی خۆراسان، لەدایك

پێکردووه، ئاخۆ زیندووبوونەوەی مرۆڤەکان چۆن بێت کە لە بەرزترین پلەی بووندان؟

مردن گەیشتنەوەیە بە خۆشەویستان. دەرچوونە لە دونیای تەسک و تەنگ و پڕ ئاستەنگەوە بۆ چوونە ناو ژیانێکی پڕخۆشی و گەیشتنە بە باخە پڕ لە میهرەبانییەکانی خوای گەورە.

خەو بۆ مرۆڤەکان و بۆ دەروون نائارامەکان هۆکاری حەوانەوەیە. وەك دەزانین لە خەودا هیچ بیرۆکەیەك نییە و بۆ خەو زیندان و کۆشك وەك یەکە. مردنیش کە برا گەورەی خەوتنە بۆ ئەوانەی کە بەڵا و کارەسات و نەخۆشییان هەیە نیعمەتێکی گەورە و ڕەحمەتە.

کە لە حاڵەتێکی وەك پیریدا کە دونیا لە مرۆڤ تەسك دەبێتەوە، مردن ڕزگاربوونە ئەگەر مردن نەبووایە کاتێك مرۆڤ دەست و قاچی لەکاردەکەوتن و نەیدەتوانی بجوڵێت بە هەموو هێزی هاواری دەکرد و داوای مردنی دەکرد ئەگەر مردن نەبووایە ژیان پڕ دەبوو لەناخۆشی و جێیەك نەدەما قاچی تێدا دابنێین، شاخ و دەرو دەشت پڕ دەبوو لە باوباپیرانمان کە نەمردوون و ماون. ئەو مار و مێروانەی لەماوەی ساڵێکدا

---

بووە و لە شاری کۆنیای تورکیا و لە ١٧ ی کانونی یەکەمی ١٢٧٣ کۆچی دوایی کردووە. لە دونیای ئیسلامی و سۆفیگەریدا بە پێشەوای تەریقەتی مەولەوی دادەنرێت و وتەو کتێبەکانی تا ئێستاش لە جیهاندا لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە دەکرێت و ڕێکخراوی یونسکۆی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی (٢٠٠٧)ی لە جیهاندا بە ساڵی مەولانا دەستنیشانکرد. لە کتێبەکانی: المثنوی، فیه مافیه، الدیوان الکبیر، و مکتوبات.)

دەمرن ئەگەر نەمردنایە هەموو دونیا پڕ دەبوو لەوانەو هەتا بەری لوتمان دەچەقین لەناو ئەو پاشەڕۆیانەدا.

هەروەکو ئەمانەش هاتنی مردن بۆ مرۆڤیش ڕەحمەتێکی گەورەیە.[1]

لەدوای ئەم وەڵامە جوانە برا کۆچکردووەکەم هاتەوە یاد، زۆر بە گەنجی لەدەستماندا، منیش و دایکیشم زۆر بۆی گریاین و زۆر ناڕەحەت بووین، بەتایبەتی دایکم بۆ چەند مانگێك نەهاتەوە سەر خۆی.

## بۆچی هەندێك کەس هەر بە منداڵی دەمرن؟

دەربارەی منداڵ و بێتاوانەکان لێم پرسی:

– ئەوان هەم دەهێنرێنە دونیاوە هەم پێش ئەوەی ئەوەندە بژین، لە گەنجێتیدا و بگرە لە منداڵیدا دەمرن. نازانم بۆچی وایە، هەرچی دەکەم تێناگەم؟

وەڵامەکانی کاك ئەرکوت زۆر سەلمێنەر و قایلکەر بوون. دەتوت لەگەڵ هەر پرسیارێکدا کەمێك زیاتر دێمەوە سەر خۆم و دەحەوێمەوە.

– باوەڕ ڕەچەتەیەکە کە مردنیش لای مرۆڤ جوان دەکات.

دایکێك کە منداڵەکەی لەدەست دەدات، قبوڵی مردن ناکات و لێی تێناگات. بەرگەی ئەو بیرکردنەوەیە ناگرێت کە لە جگەرگۆشەکەی جیابێتەوە و منداڵەکەی بڕزێت و جارێکی تر نەیبینێتەوە. عەقڵ لە سەریدا نامێنێت و نایەوێت بیر لە هیچ بکاتەوە، بەهەمان شێوە خۆیشی وەك مردووی لێ دێت.

---

١– مەکتوبات، "مەکتوبی یەکەم".

باوەڕ، تاکە ڕەچەتەیە کە ئاسوودەیی دەبەخشێتە دەروونی ئەو دایك و باوکەی منداڵیان مردووە.

مردنی منداڵ پێش تەمەنی پێگەیشتنی بۆ باوەڕداران دەبێتە هۆی ئەوەی بۆ هەتا هەتایە خۆشی لە منداڵەکەیان وەرگرن. لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا منداڵبوون نییە، ئەو منداڵانەی لە پێش تەمەنی پێگەیشتندا دەمرن دەبنە ئەو منداڵانەی لە باخەکانی بەهەشتدان. وەك بەرامبەرێك بۆ ئەو خۆشییەی دایك و باوك خۆشییەکی هەمیشەیی لە خۆشویستنی منداڵەکانیاندا دەستدەکەوێت.

هەروەها ئەو منداڵانەی پێش تەمەنی پێگەیشتن دەمرن و دەچنە بەهەشت دەبنە هۆی تکاکار و ڕزگاری دایك و باوکیشیان.

ئەو منداڵەی دەبێتە هۆی ئەوەی دایك و باوکی ژیانێکی هەمیشەیی ببەنەوە، بە مردنی بووەتە هۆی ئەوە.[1]

بۆ ئەوەی زیاتر لەم بابەتە تێبگەین ، بەدیعوزەمان نموونەیەکی لەم شێوەیە دەهێنێتەوە:

"سەردەمێك پیاوێك لە بەندیخانەدا بوو. ماوەیەکی زۆری نەخایاند کوڕە خۆشەویستەکەشیان خستە لای! ئیتر جگە لە ئازاری تایبەتی خۆی، ئازاری کوڕەکەشی و نەتوانینی دابینکردنی حەوانەوەی ئەوەندەی تر ئازارەکەی زیاد کردبوو.

فەرمانڕەواکەش لەبەرئەوەی زۆر میهرەبان بوو. مرۆڤێکی نارد بۆلای ئەم پیاوە کە پێی بڵێت:

---

١- مەکتوبات، "مەکتوبی حەڤدەیەم".

(هەرچەندە ئەم منداڵە هی تۆیە بەڵام لەهەمان کاتدا یەکێکە لە دانیشتوانی وڵاتەکەم و گەلەکەم. وا ئێستا دەیبەم بۆلای خۆم و لە کۆشکێکی گەورە و ڕەنگین و ڕازاوەدا پەروەردەی دەکەم.

باوکە بەندکراوەکەش کە ئەمەی بیست دەستی دایە گریان و ئاخ و ئۆف کردن و خەفەت خواردن.. پاشان وتی:

(نەخێر ناتدەمێ. چونکە ئەم کوڕە هۆی دڵنەوایمە لەم بەندیخانەیەدا)!

هاوەڵەکانی بەندیخانەشی پێیان وت:

(برادەر! هیچ پێویست بە خەمخواردن ناکات و خەفەتیش دادی تۆ نادات. ئەگەر تۆ خەمی کوڕەکەتە، ئەوا بۆ کۆشکێکی بەرینی ڕازاوە دەڕوات لەبری مانەوەی لەم بەندیخانە تەنگ و نالەبار و ڕزیوەدا. خۆ ئەگەر خەمی خۆتە و بەدوای بەرژەوەندیی تایبەتی خۆشتدا دەگەڕێیت، ئەوا باش بزانە ئەگەر کوڕەکەت لێرەدا بۆ مەبەستی دڵدانەوە و خەمڕەوێنی تۆ بمێنێتەوە – کە سوودێکی کاتییە و لەوانەشە هەرگیز نەیەتە دی – تووشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبێت.

بەڵام ئەگەر بڕواتە ئەو کۆشکەی پادشا. دەبێت بەهۆی دەستکەوتنی هەزاران سوود بۆ تۆ. چونکە مانەوەی لەوێ دەبێتە تکاکارت و هەوڵی جووڵاندنی بەزەیی فەرمانڕەوا سەبارەت بە تۆ دەدات، ئیتر ڕۆژێك دێتە پێش کە فەرمانڕەوا حەز بکات لەگەڵ کوڕەکەتدا بەیەکتر شاد ببنەوە. خۆ گومانیشی تێدانییە کوڕەکەت نانێرێتەوە بەندیخانە بۆلای تۆ، بەڵکو تۆ دەردەکات و دەتباتە ناو ئەو کۆشکە و، لەوێ بە دیتنی شاد و بەختەوەر

دەبیت.. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی پاشا بیت و باوەڕت پێی هەبێت.)"[١]

ئینشائەڵڵا... بەڵام کەسێکی تاوانباری وەك من چی داوە لە بەهەشت و بینینەوەی براکەی؟ خۆزگە بفەوتامایەو ئەو ڕۆژانەم نەبینیایە.

## بۆچی خوای گەورە خراپە و شەیتانی دروستکردووە؟

پاشان دوو پرسیارم کرد کە سالانێك بوو سەرقاڵیان کردبووم، تەنانەت ئەو دوو پرسیارە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبوو.

یەکەمیان ئەوەبوو کە خوای گەورە بۆچی خراپەو شەیتانی دروست کردووە؟ ئەوە مانای ئەوە نییە کە خوا (حاشا) مرۆڤەکان بە قەستی پاڵ پێوەدەنێت بۆ خراپە؟ ئەگەر خراپەو شەیتان درووست نەکرانایە مرۆڤ کوا تاوانی دەکرد؟

دووەم پرسیاریش دەربارەی چارەنووس بوو. مادام خوای گەورە پێش لەدایکبوونمان چارەنووسمان دەنووسێت، بۆچی ئێمە دەبینە لێپرسراو لەبەردەم تاوان و هەڵەکانماندا؟ با شتی چاکی بنووسیایە تا ئێمەش کەسێکی باش بووینایە.

کاك ئەرکوت لەلایەکەوە قومی لە چایەکەی دەدا و لەلایەکیشەوە دەیویست ورەم پێ بدات:

---

١- مەکتوبات، "مەکتوبی حەفدەیەم".

– ئافـەرین سـێڤدا خـان. ئـەم پرسـیارانە هـەموو مرۆڤێـك نایانكـات، كەسـێكی زیـرەك دەیانكـات كـە مێشـكی تێـك درابێـت. هـەر لـە یەكـەم پرسیارەوە دەمزانی خاتوونێكی زیرەكی.

نەخێر، لە ڕاستیدا ئەوەندەش زیرەك نەبووم ، من خۆم دەناسم، كاك ئەركوت دەیویست ڕازیم بكات.

پرسیاری یەكەمی ئاوا وەڵام دایەوە:

– " بەدیهێنانی(خلق)ی شەڕ، شەڕ نییە.. بەڵام بەدەستهێنان(كسب)ی شەڕ بە شەڕ دادەنرێت، چونكە ئـەو مرۆڤـە تەمبەڵـەی زیـانی لـە بارانـەوە پێگەیشتووە –ئەو بارانەی كە گەلێك بەرژەوەندیی تێدایە – مافی ئەوەی نییە بڵێت: باران میهرەبانی نییە. هەروەها بۆ ئـەو چـەقۆیەی كـە دەسـتی دەبڕێـت و ئـەو ئـاگرەی دەسـتی دەسـوتێنێت ناتوانێـت وا بڵێـت. لـە دروستكردندا لەگەڵ هەر شەڕێكی بچووكدا چـەندین خێـری گـەورە هەیـە. لەبەر ئەو خراپە بچووكەی لێی دەوەشێتەوە مرۆڤ ناتوانێت واز لە خێرێكی گەورە بهێنێت و بڵێت شەڕێكی گەورەیە.

دروسـتكردنی شـەیتان خراپـە نییـە بـەڵكو زەلیـل بـوونی مـرۆڤ لـە دەستیدا خراپەیە. شەیتانەكان ناكەونە ویزەی فریشتەكان، لەبـەر ئـەوەی پلە و پایەیان نەگۆڕە. ئەوەی مرۆڤ بـەرز دەكاتـەوە ئەوەیـە كـە بەرامبـەر وەسوەسەی شەیتان وریا بێت و بە ئیرادە بێت.[1]

---

١– وتەكان، "وتەی بیست و شەشەم".

## ئەگەر خودا قەدەر دەنووسێت بۆچی لە کارەکانمان لێپرسراو بین؟

بۆ وەڵامی پرسیاری دووەمیش کتێبەکەی بەردەستی کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوە:

- "هەموو بوونەوەر و دروستکراوەکان، بە فەرمان و ویستی خوای گەورە دروست بوون. چاکە و خراپە بە دانایی و دەسەڵاتی ئەو دروست بوون، بەدەر لە زانست و ویستی ئەو زاتە تەنانەت میشێکیش ناتوانێت باڵی ڕاوەشێنێت، یاخود گەڵایەك ناتوانێت جووڵە بکات.

خوای گەورە بە زانستی خۆی دەزانێت و دەبینێت ئێمە لە ئایندەدا چی دەکەین و لە قەدەرمان دەینووسێت. ئەگەر نا ناچێت لە قەدەری هەندێك مرۆڤدا چاکەو چاکەکاری و لە قەدەری هەندێکیشیان خراپە بنووسێت.

بۆ نموونە کەسێك لە پەنجەرەی شوقەکەیانەوە خۆی فڕێ داتە خوارەوە، واتە خۆی دەکوژێت. نووسینی ئەمە لە قەدەری ئەودا، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە خوای گەورە پێشتر دەیزانێت. سزادانی بەندەش لەسەر ئەمە بەهۆی ئەوەوەیە کە بە ئیرادەی خۆی ئەو کارەی کردووە، بەڵام ئەگەر کەسێکی تر لەپڕ لە پەنجەرەی شوقەکەوە بکەوێتە خوارەوە و بمرێت، ڕاستە لە قەدەریدا هەیە، بەڵام ئەمە نابێتە هۆی سزادانی. ئەمە مانای ئەوەیە قەدەر ئیرادەی مرۆڤ نابەستێتەوە. نووسینی چاکەو خراپە لەقەدەری مرۆڤدا لە لایەن خوای گەورەوە بەویستی خۆی، پێچەوانەی

دادپەروەرییەتی. ئەگەر ئەمە وا بووایە ئـەوا پێویسـتی نـەدەکرد مـرۆڤ بـۆ تاقیکردنەوە بنێردرێتە دونیا.

خوای گەورە لەبەر ئەوەی دەزانێت کێ تاوان دەکات و کـێ چـاکە دەکات. تاوانبارانی بـۆ دۆزەخ و چـاکەکارانی بـۆ بەهەشـت دانـاوە، بـەڵام خوای گـەورە مرۆڤـەکانی خسـتووەتە تاقیکردنـەوەوە. ئـیرادەی بـە مـرۆڤ داوە و گرتنەبـەری ڕێـی ڕاسـت و هەڵـەی داوەتـە دەسـت خـۆی. لەگـەڵ ئەمانەشدا پەیامبەر و کتێبەکانی ناردووە تاوەکو ڕێی چاکە پیشانی مـرۆڤ بدەن. بە فەرمان کردن بە چاکە خەڵکیان لە خراپە دوورخستووەتەوە.

ئەو کارانەی لە مرۆڤدا دەردەکەون دەبن بە دوو بەشەوە، کۆمەڵێك لەمانـە بـە تـەواوی دوور لـە ئـیرادەی ئێمـە ڕوودەدەن کـە پێیـان دەڵێین (قەدەری ناچاری)، لەم قـەدەرەدا هـیچ لێپرسـراویەتییەك ناکەوێتـە سـەر مرۆڤ و هـیچ پاداشتێکیشـی نییـە لـە بەرامبەریـدا. دەکرێـت نموونـەش بـۆ ئەمانە جوولەی پێڵووی چاوەکانمان، سوڕی خوێنمـان، ڕەگـەزمان یـاخود نەتەوەمان بێت. بەشی دووەمـیش ئـەو کارانەیـە کـە بـە ئـیرادەی خۆمـان دەیکەین. خێر و شەڕیش کە لێرەدا جێی باسە دەکەوێتە ژێر ئەم بەشـەی قـەدەرەوە کـە پێـی دەوترێـت (قـەدەری ئیختیـاری) وەك خـواردن و سەیرکردن و خواردنەوە و قسەکردن. کەسێك کە لە ویژدانیـدا بزانێـت کـام کارەی لە بەشی (ئیختیاری)یە و کامەی (ناچاری)یـە چـۆن و بـە چ مافێـك دەتوانێت لە بەرامبەر ئەو خراپەیەدا کە دەیکـات بڵێـت: (مـن چـی بکـەم؟ ناچار بووم ئەو کارە بکەم چونکە لە قەدەرم وا نووسراوە...)

کاتێك کەسێك کارێکی چاکەی کرد دەست بکات بە باسکردنی خۆی بڵێت: (من وام کرد. و ئاوام کرد) چۆن مافی ئەوەی هەیە خراپەکانی حەواڵەی قەدەر بکات؟ ئەمە لە کاتێکدا هەر هەمان خراپە کەسێك بەرامبەر ئەم بیکات کارەکە ناداتە پاڵ قەدەر! ! بۆ نموونە کاتێك داوا تۆمار دەکات لەسەر ئەو دزەی چووەتەماڵیان قەدەری بیر ناکەوێتەوە. خۆی ناگرێت و تووڕەبوونەکەی ناخواتەوە ئەگەر دزەکە لەبەردەم دادوەردا بڵێت: (من چ تاوانێکم هەیە؟ لەبەر ئەوەی لە قەدەرمدا خراپە هەیە وا بە ناچاری دزی دەکەم). بە هەمان شێوە کاتێك دەستی خستووەتە بینی ئەو کەسەی هەوڵی کوشتنی منداڵەکەی داوە، وا بیر ناکاتەوە کە لە قەدەری ئەو کەسەدا وا نووسراوە. یاخود کاتێك کەسێك بە چاوێکی خراپەوە دەڕوانێتە ئابڕووی، ناڵێت لە قەدەرمدا وا نووسراوە مافم نییە بە سەریەوە. کەواتە دەتوانێت کاتێك خۆی لەو جۆرە کارانە دەکات بیداتە پاڵ قەدەر؟" (موحەممەد کرکنجی)

(مرۆڤ بە تەواوەتی بەرپرسیاری کردەوە خراپەکانیەتی، چونکە مرۆڤەکە خۆی ئەو کردەوە خراپانەی "ویستووە". جا لەبەرئەوەی کردەوە خراپەکان لە بابەتی "ڕووخاندن"ن ئەوا مرۆڤ دەتوانێت تەنیا بە یەك کردەوەی خراپ ڕووخاندنێکی گەورە ئەنجام بدات، بەڵام لە کردەوە چاکەکاندا، مرۆڤ مافی شانازی و بەخۆنازینی نییە، لەبەر ئەوەی بەشی ئەو لە کردەوە چاکەکاندا یەکجار کەمە، چونکە تەنها "میهرەبانی"ی

خوای گەورە "داخوازی" ئەو کردەوە چاکانە بووە و ویستوویەتی ئەنجام بدرێن)[1]

بەکورتی ئەوەی کە ئێمە لە ژیانماندا چۆن دەژین و ئەوەی خوای گەورە پێش وەخت ئەمە بزانێت، ئازادی ئێمە سنووردار ناکات و ئاراستەی ناکات بۆ هیچ شوێنێك، چونکە ئێمە سەربەست و ئازادین لەوەی کە چی دەکەین. لەبەر ئەوە قەدەر لێپرسراو نییە لەوەی ئێمە دەیکەین، بەڵکو خۆمان لێپرسراوین.

دەتوانیت چی بڵێیت بەرامبەر ئەم وەڵامە جوانانە؟

ئەم وەڵامانە دەرمانێکی زۆر کاریگەر و چاك بوو بۆ ئەو نائارامی و کێشانەی لە ناخمدا بوون. چونکە یەکەمجارم بوو لێپرسینەوە لەگەڵ خۆمدا بکەم.

خوایە گیان! من خەون دەبینم یان بەڕاستی دەژیم؟ چی دەبێت با خەونێك نەبێت کە بەئاگاهاتم تەواو بێت.

## مەرجە نوێژ بکەین؟! خۆشەویستی خودا بەس نییە بۆ ئێمە؟!

– ئایا نوێژ مەرجە بۆ زانین و ناسین و بەندایەتیکردنی خوا؟ مرۆڤ دەتوانێت بێئەوەی نوێژیش بکات خودا بناسێت، و ڕێزی لێبگرێت. ئەم هەستان و دانیشتنە چ مانایەکی هەیە؟ بۆچی لە مەسەلەی نوێژ و پەرستشەکاندا ئەوەندە زۆرمان لێ دەکات؟

---

١– وتەکان، "وتەی بیست و شەشەم".

کاك ئەرکوت گەڕا بەدوای وەڵامەکەدا و دەستی کرد بە خوێندنەوە:

- "داواکاری خوای گەورە لەسەر پەرستشی ئێمە و فەرمانکرنی لەسەر نوێژکردنی ئێمە. بۆ ئاسوودەیی مەعنەوی و ماددی ئێمەیە. نەك لەبەر ئەوەبێت (حاشا) خوای گەورە پێویستی بە پەرستشی ئێمە بێت.

چەندە بێ مانایە نەخۆشێك بەرامبەر دکتۆرێکی بە بەزەیی کە دەیەوێت دەرمانێکی بداتێ بڵێت: (تۆ چ پێویستیت بەوە هەیە کە من ئەم دەرمانە بخۆم؟) چونکە ئەو نەخۆشە پێویستی بە دەرمانخواردنە نەك دکتۆر.

بەم شێوەیەش خوای گەورە نە پێویستی بە پەرستش و نە هیچ شتێك نییە. ئەوە مرۆڤە پێویستی بەوەیە بە سوپاسگوزاری و پێزانینەوە مرۆڤایەتی خۆی بسەلمێنێت و هەوڵ بدات ئاسوودەییەکی هەمیشەیی دەست بکەوێت.[1]

لە کتێبی وتەکانیشدا بەم شێوەیە باس دەکرێت:

"جارێکیان فەرمانڕەوایەکی گەورە دوو خزمەتگوزاری خۆی بۆ باخچەیەکی تایبەتیی جوان نارد کە دوو مانگ ڕێ دوور بوو، تاکو پێی بگەنە مەزراکە و لەوێ نیشتەجێ بن. یەکی بیستوچوار لیرەی زێڕیشی دانێ و پێیوتن:

(بلیت و پێداویستیەکانی گەشتەکەتان و، پێویستیەکانی ناوماڵ و نیشتەجێبوونتان، بەم پارەیە بکڕن.. دوای ڕۆژە ڕێیەکیش دەگەنە وێستگەیەك کە هەموو هۆکارەکانی گواستنەوەیان تێدایە لە ئۆتۆمبێل و،

---

١- بریسکەکان، "بریسکەی بیست و سێیەم".

فڕۆکە و، شەمەندەفەر و، پاپۆڕ.. سواربوونی هەرکام لەمانەش بە گوێرەی سەرمایەی ئەو کەسەیە کە سواری دەبێت) .

ئــەوانیش دوای وەرگرتنــی ئــەم وانــە و ئامۆژگارییانــە، کەوتنــەڕێ. یەکێکیان لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی بەختەوەر و شادمان و ژیر بوو، بەشێکی پارەکەی بە جۆرێك فەرمانڕەوا پێی ڕازی بێت، خستەکار و کەسابەتەوە تا گەیشــتە وێســتگەکە و، ســوود و قــازانجێکی زۆری لــێ دەســتکەوت بــە چەشنێك کە سەرمایەکەی یەك بۆ هەزار زیادی کرد .

بەڵام ئەوی تریان کــە تــابلێی بەدبــەخت و بــەدخوو بــوو، تــا گەیشــتە هەمان جێ، بیست و سێ لیرەی لە قوماروموماردا خەرج کرد و تــەنیا یــەك لیرەی پێ مایەوە ! لەبەر ئەوە، برادەرەکەی پێیوت:

کاکی خۆم! ئەم لیرەیەی ئێستا پێتماوە بلیتی سەفەری پێبکڕە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگا دوور و درێژەدا بــە برســێتی و ئــاوارەیی نەمێنیتــەوە، بــە خۆڕایی لە دەســتی مــەدە. فــەرمانڕەوای گــەورەشمان تــابلێی لــێبوردە و جوانمەردە، بەڵکو لــە کــەم و کووڕییــەکانت خــۆش ببێــت و تــۆش ســواری فڕۆکە بکات و پێکــەوە لــە مــاوەی ڕۆژێکدا بگەینــە جێگــەی خۆمــان. خــۆ ئەگەر بە گوێیشم نەکەیت، ئەوا ناچار دەبیت کە بە پــێ بکەویتــە ڕێ و بــە دوو مانگی ڕەبەق و بە برسێتی و نامۆیی و تەنیایی ئینجا بیبڕیت و بگەیتە جێ.

جا ئەگەر ئەم هاوڕێیە سەرپێچیی نواند و بەو تاکە لیرەیە ئەو بلیتەی نەکڕی – کە وەك کلیلی دەرگای گەنجینەیەك وایە – بەڵکو لــە ئــارەزوو و

ڕابواردنێکی سەرپێییدا بەکاری هێنا، ئایا تێنەگەیشتووترین مرۆڤیش ئەم کارە بە بێعەقڵی و بەدبەختی لە قەڵەم نادات؟

بیست و چوار لیرەکە، بریتیە لەو بیست و چوار سەعاتەی شەو و ڕۆژ کە تەمەنی مرۆڤیان لێ پێکدێت.. مەبەست لەو بلیتەش (نوێژ)ە، لە ڕاستیدا تەنیا یەك سەعات لەو بیستوچوار سەعاتە سەروزیادە بۆ نوێژ و دەستنوێژی ماوەی ئەو شەو و ڕۆژە. ئایا ئەو کەسەی کە بیستوسێ سەعاتەکەی شەو و ڕۆژ بۆ ئەم دنیا زۆر کورت و کەمە سەرف دەکات و تاقە سەعاتێکیشی بۆ ژیانی نەبڕاوەی هەمیشەیی تەرخان ناکات، چەندە ستەم لە خۆی و کارێکی دوور لە ژیری دەکات؟! سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ئەو کەسەی نوێژەکانی بەجێ دەهێنێت، بەهۆی نیەتی پاك و خاوێنەوە، هەموو کار و کۆششێکی حەڵاڵی تری بۆ دەبێت بە پەرستش و، بە عیبادەت بۆی دەژمێررێت"[1].

دووبارە لە هەمان کتێبدا بەم شێوەیە دەربارەی گرنگی پەرستشەکان دەدوێت:

" جارێکیان دوو سەرباز فەرمانیان پێکرا کە بڕۆن بۆ شارێکی دوور. ئەوانیش پێکەوە کەوتنەڕێ، گەیشتنە دووڕیانێك لەوێدا پیاوێکیان بینی، ئەم پیاوە پێی وتن:

(ڕێگای دەستە ڕاستیان سەرەڕای ئەوەی بێزیانە، ئەوانەش کە دەیگرنە بەر بە ڕێژەی "نۆ لە دە" قازانجیان دەست دەکەوێت و بە ئارامی و بێ ماندووبوونیش دەیبڕن تا دەگەنە جێ. بەڵام ڕێگای دەستە

---

١- وتەکان، "وتەی چوارەم".

چەپیان سەرەڕای ئەوەی هیچ دەسکەوتێکی تێدا نییە، "نۆ لە دە"ی ئەوانەش کە دەیگرنەبەر تووشی زەرەر و زیان دێن.. ئەوەش بزانن کە هەردوو ڕێگاکە بە ئەندازەی یەك دوورن، ئەوەندە هەیە ڕێگای دەستە چەپ، لەبەر ئەوەی سەر بە هیچ ڕژێم و یاسایەك نییە، ئەو ڕێبوارەی پیایدا دەڕوات چەك و تفاق لەگەڵ خۆی هەڵناگرێت و، بەم پێیە سووکی و حەوانەوەیەکی ڕووکەشی تێدا دەبینێت، بەڵام ڕێگای دەستە ڕاست، لەبەر ئەوەی لە ژێر سایەی یاسادایە، ئەو ڕێبوارەی دەیگرێتەبەر ناچار دەبێت چەکێکی ڕەسمی بە قورسیی دوو کیلۆ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت و، نزیکەی چوار کیلۆ خۆراکیش بخاتە ناو هەگبەکەیەوە، تا بتوانێت بەسەر هەر مەترسی و کۆسپ و دوژمنێکدا – کە لەوانەیە بێنە ڕێی – سەربکەوێت).

پاش ئەوەی ئەم دوو سەربازە گوێیان لە وتەی ئەو ڕابەرە شارەزایە ڕاگرت، بەختەوەرەکەیان ڕێی ڕاستی هەڵبژارد. بەم چەشنە کۆڵێکی قورسی بە کێشی یەك باتمان هەڵگرت، بەڵام "دڵ" و "ڕۆح"ی لە منەت و ترس و ئازارێکی ئەوتۆ ڕزگاریان بوو کە هەزاران جار لەو کۆڵە قورستر بوو (گەر ئەو ڕێگایەی نەگرتایەتە بەر)..

کەچی بەدبەختەکەیان لەبەر ئەوەی حەزی لە پەیڕەویکردنی یاسا نەبوو، دەستی لە سەربازی هەڵگرت و ڕێگای چەپی هەڵبژارد. خۆ هەرچەندە بە ڕواڵەت لە هەڵگرتنی ئەو کۆڵە قورسە ڕزگاری بوو بوو، بەڵام "دڵ و دەروون"ی کەوتبوونە ژێر منەت و ئازارێکی ئەوەندە قورسەوە کە بە هەزاران جار لە هەڵگرتنی ئەو کۆڵە قورستر بوو.. "ڕۆح"یشی هەردەم لە ترس و بیمدا دەیناڵاند و، هەر کەسێکی لە ڕێگادا دەبینی دەستی لێ

پـان دەكـردەوە و، لـە هـەموو هەڵوێسـت و ڕووداوێكـی ڕێگـادا ترسـی لێدەنیشت! هەر بەم جۆرە، ڕێی بڕی تا گەیشتە جێی مەبەست و، لەوێ بە سزای یاخی بوون و هەڵهاتنی خۆی گەیشت .

ئەوی تریشیان كە ڕێی ڕاستی گرتەبەر و پەیڕەوی ڕێبازی سەربازیی كرد و چەك و كەرەستەی خۆی پاراست، بە دڵێكی پڕ لە ئارامی و دەروونێكی پڕ لە هێمنییەوە ڕێگای بڕی تا گەیشتە جێگای مەبەست، بێئەوەی ئاوڕ لە كەس بداتەوە و منەتی كەس هەڵبگرێت، یاخود لە هیچ كەسێك بترسێت. ئیتر لەوێ پاداشت و خەڵاتی شایانی خۆی وەرگرت.

بزانە ئەو دوو ڕێبوارە: یەكەمیان ملكەچ و فەرمانبەردارانی یاسای خواوەندن، مەبەست لەوی تریشیان ئەوانەن كە یاخی بوون و، شوێنی نەفس و ئارەزووی دەروونی خۆیان كەوتوون .

ئەو ڕێگایەش: ڕێی ژیانە كە لە "جیهانی ڕۆح"ەوە دەست پێدەكات و لە گۆڕەوە تێپەڕ دەبێت و لە جیهانی ئەودنیا كۆتایی پێدێت .

ئەو چەك و هەگبە و تفاقەش بریتین لە: تەقوا و پەرستش، چونكە پەرستش هەرچەند لە ڕواڵەتدا ئەركێكی قورس و گران بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئاسانی و حەوانەوەیەكی ئەوتۆی تێدایە كە لە باسكردن نایەت. خۆ ئەگەر گۆی زەوی بۆمبایەك بێت و بتەقێتەوە، لەوانەیە مرۆڤی خواپەرستی دڵڕووناك نەترسێنێت و، بە موعجیزەیەكی دەستەڵاتی پەروەردگاری بزانێت و بە ڕێز و سەرسوڕمان و چێژەوە لێی وردببێتەوە.[1]

---

١- وتەكان، "وتەی سێهەم".

ئەو ڕاستییانەی لەم کتێبانەدا دەخوێنرانەوە، هەموو گەنجان و بگرە هەموو مرۆڤەکان پێویستیان پێی بوو. پێویست بوو هەرچی زووترە بگەیەنرێتە دەست هەموو کەس .

## ئەگەر ئایینی ئیسلام یەکە، ئەی بۆچی مەزهەبی جیاواز هەیە؟

یەکێکی تر لەو پرسیارانەی لە مێشکمدا جێی خۆی کردبووەوە، ئەوەبوو کە بۆ لە ئاییندا چەند مەزهەبێکی جیا هەیە؟ نەمدەتوانی ئەمە شیکار بکەم، ئەگەر دین یەکە ئەی بۆچی مەزهەبی جیاواز جیاواز دەرکەتوون، چی پێویست بەم مەزهەبانەیە؟

کاك ئەرکوت وەڵامی دایەوە:

– زۆر گرنگی بەم پرسیارەت دەدەم. چونکە ئەوانەی لەم بابەتەدا زانیاری تەواویان نییە دەڵێن، ئایەت هەیە، فەرموودە هەیە، پێغەمبەر هەیە؟ ئەمانە هەبن چ پێویستییەك بە مەزهەب هەیە؟ ئایا ئەوانە بە تەنها بەس نین بۆ ئەوەی بە موسوڵمانێتی بژین؟

بەڵام ئەسڵی مەسەلەکە وەك ئەوە نییە کە دەبینرێت. مەزهەب، واتە ڕێگە یان ڕێباز. بەمانایەکی تر لە ڕووی ئایینیەوە دۆزینەوەی جوانترین و ئەنجامدانی باشترینە. بەپێی ئەم مانایە مەزهەب جیابوونەوە نییە، بەڵکو هەوڵی پێشکەشکردنی جوانترین ڕێگایە. لە ئیسلامدا مەزهەبەکان نکوڵی لە یەکتر ناکەن، بە پێچەوانەوە بەڵکو یەکتر پشتڕاست دەکەنەوە. تەنانەت ئەگەر بۆشاییەك لە یەکێکیاندا هەبێت مروڤی موسوڵمان بەگوێی پەیڕەوی ئەوی تر دەکات.

مەزهەبەكان، ڕاستییەكی كۆمەڵایەتی دەخەنەڕوو، بە مانای ئەوەی بۆ ژیانی كۆمەڵ پێویستە.

بەدیعوززەمان بەم شێوەیە باسی ئەم بابەتە دەكات:

"ئـاو خواردنــەوە یەكـە بـەڵام بـۆ مرۆڤـەكان لـە حاڵـەتی جیاجیـادا حوكمەكەی دەگۆڕێـت. گۆڕانكاریەكـە لـەوە دانییـە كـە ئاوەكـە دەگۆڕێـت بەڵكو پێویستی نەخۆشییەكە وا دەكات.

پیاوێك لە دەشتێكدا ماوەتەوە و لە تینوێتیدا لێوەكانی قڵیشاوە، لەم حاڵەتەدا ئاو شیفایەو لە ڕووی پزیشكیشەوە خواردنەوەی واجبە.

بۆ نەخۆشێك كە تازە لە نەشـتەرگەری هاتووەتـە دەرەوە وەك ژەهـر وایە و لە ڕووی پزیشكیشەوە حەرامە.

لە سەرمادا كاتێك كەسێك ئاوێكی زۆر لـە لەشـیدابێت زیـانێكی كـەمی هەیە و لە ڕووی پزیشكیشەوە مەكروهە.

لە ڕۆژی گـەرمای هاویـنـدا سـوودی هەیـە بـۆ فێنككردنـەوەی كەسـێك كەواتە سوننەتە بۆ ئەویش.

لەكاتێكیشدا بۆ كەسێك نەزیانی هەبێت و نە سوود. ئەوا بۆ ئەو كەسە موباحە(ڕێپێدراوە).

وەك دەبیـنـین حەقیقـەت و ڕاسـتی لێـرەدا پێـنج جـۆر بـوو. چـۆن دەتوانین بڵێین ئاو هەموو كاتێك واجبە؟

حوكمە شـەرعیەكان و وردەكارییـەكانی سـەیری پێویسـتی مرۆڤـەكان دەكات. حەكیمی ناو مەیدانەكـە كـە ئیمـامی مەزهەبـەكانن سـەیری ژیـانی

پێغەمبەر ﷺ دەکەن و بەپێی باری کەسەکە ڕەچەتەکە دەدەنەوە دەست کەسەکە.

کەواتە ئەوە دەرمانەکە نییە کە دەگۆڕێت. بەڵکو نەخۆشەکەیە. ئەو جیاوازیانەش کە لە نێوان ئیمامی مەزهەبەکاندا دەبینرێت هەر ئەمانەیە.[1]

ئەم پرسیارەم لە مامۆستای ئایینمان کردبوو لە قوتابخانە، بەڵام ئەو ئاوا ڕوونی نەکردەوە، بۆیە هەرکاتێك وشەی (مەزهەب)م ببیستایە، مێشکم تێکدەچوو.

هەروەها پرسیم لەنێوان موسوڵماناندا چەندین کۆمەڵ و گرووپی جیاوازم بینیوە، ئیسلام یەکە، قورئان یەکە، پێغەمبەر یەکە... باشە ئەم هەموو یەکێتییە هەیە ئەی ئەو هەموو گرووپ و کۆمەڵانە چین؟

وتی:

- ئەمەش ڕوویەکی تری پرسیارەکەیە، وەك چۆن مەزهەبەکان پێویستین، بە هەمان شێوە بۆ کۆمەڵەکانیش هەروایە، با بەم شێوەیە ئەمە ڕوون بکەینەوە:

باوەڕدارێك باسی خوا دەکات بۆ کەسێك، ئەگەر ئەو بتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی حەڵاڵ و حەرام و بەندایەتی بۆ خوا بگەیەنێت بەو کەسە، ئەوا مرۆڤێکی گەڕاندوەتەوە، ئەگەر لە جێیەکی تر، مرۆڤێکی تر، بە هەمان ڕێگە یان ڕێیەکی جیاواز هەمان کار بکات، ئەوا دوو کەس ڕزگاریان بوو. چاکەی هەردووکیشیان وەك یەك دەنووسرێت. چونکە یەك شتیان دەوێت و ئەوەی کە داوای دەکەن هەمان شتە.

---

١- وتەکان، "وتەی بیست و حەوت".

بـه شـێوەیەکی گشـتی، تایبەتمەنـدبوون بـەپێی خـووی کەسـەکان، شتێکی چاکە و بگرە پێویستیشە، وەك چۆن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەموو کەسێك هەمان کار ناکات، ئـەوا بـە هـەمان شـێوە لـە ژیـانی مەعنەویشـدا هەمان کار ناکـات، ویسـت و توانـا و داواکـاری مرۆڤـەکان وەك یـەك نییـە، مـرۆڤ دەکرێـت وەك سـۆپەرمارکێت بێـت و وەڵامـی هـەموو داواکاریـەك بداتەوە، لەهەمان کاتدا دەکرێت وەك میوەفرۆشێك بێـت و تـەنها بـە پێـی ئـەو توانایـەی تێیدایـە کاربکـات. بـەکورتی ناتوانرێـت داوای هـەمان توانـا لەهەموو کەسێك بکەیت.

لـە خزمـەتکردن بـە چـاکەدا ڕێگـەی جیـاواز مانـای جـودایی نییـە. تایبەتمەنـدبوون و زۆر کـارکردن، لەگـەڵ وەڵامدانـەوەی هـەموو فـیترەت و ویسـتێك بـە جێـی خـۆی ئـەنجام بەدەسـتەوە دەدات. هـیچ کاتێـك تایبەتمەنـدبوون لـە زانسـتدا بـە مانـای جـودایی و ڕەتکردنـەوەی یـەکتری نایەت.

کەسـانێك وەك ئـەوەی تـەنها خۆیـان چـاکە دەزانـن و بیردەکەنـەوە، دەکەونـە هـەوڵی ئـەوەی هـەموو لایـەك کۆبکەنـەوە، کەچـی لـە ڕاسـتیدا ئەوانەی جـوانیی و خۆشـیەکانی ژیانیـان تـام کـردووە، نایانـەوێت لەگـەڵ ئەوانـەدا بـن کـە ئـاوا بـیر دەکەنـەوە، نـەك ئـەوان بـەڵکو فریشـتەکانیش نایانـەوێت هـەم جێگـا و هـەم دانـایی ڕێگـە بـەوە نـادەن کـە هـەموو ئـەو کەسانەی خزمەت بە حەق دەکەن لەیەك ژووردا کۆببنەوە.

ئەوانەی خزمەت بە ئایین دەکەن، لە ئامانجدا یەکێتییان لێ چاوەڕێ دەکرێت. ئەوانەشی کە ئامانجیان لێڵە و لە ڕێگەی باتڵدا بەدوای حەقدا دەگەڕێن، دیارە کە لە دەرەوەی ئەو کاروانە نورانیەن.

جگە لەمانەش، ناکرێت هەر مرۆڤێکی موسوڵمان بینرا پاشگرێکی "ـی" پێوەبێت، کەس "ئەحمەدی و محەمەدی و فلانی و فیساری" نییە، ناشکرێت وابێت. لە ئایینێکدا کە قەدەغەیە ئایین بە کەسایەتیەکانەوە ببەسرێتەوە، کەس لەبەر خاتری فلان و فیسار کۆ نابێتەوە. وەك چۆن مرۆڤەکان لە هەموو زانستێکدا زانایەکیان هەیەو پێشەوایەتییان دەکات، لە ئایینیشدا هەروایە. ئەمەش بەتەواوی دوورە لەو تێگەیشتن و گومانەی دوژمنان خستوویانەتە ناو خەڵکەوە و هیچ پەیوەندییەکی پێیانەوە نییە.

هەموو کەسێك مامۆستاکەی خۆی خۆش دەوێت. کەسیش لەبەر خاتری کەس ئەو مامۆستایەی ڕەت ناکاتەوە کە سوودی لە زانستەکەی وەرگرتووە، ناشتوانێت ڕەتی بکاتەوە، پێویستیش نییە. ئەوانیش وەك هەموو خاوەن زانستێك خۆیان بۆ خەڵك باس ناکەن، بەڵکو باسی خوای گەورە و حەقیان بۆ دەکەن.

قسەکانی زۆر ڕاست بوون، وەك چۆن هەموو کارێك شارەزایی و ڕێگەیەکی تایبەت بە خۆی پێویستە. بە هەمان شێوە ئەو کۆمەڵانەی ئایین بە شێوەیەکی باش دەگەیەننە خەڵکی و هەبوونی ڕێگەی تایبەت بە ئەوان شتێکی زۆر خوازراوە.

## ئایا سەربەستی سێکسی گونجاوە بۆ ئافرەت ؟

دووبارە پرسیارێکم پرسی کە دژی خۆم بوو، بۆیە دەڵێم دژی خۆم چونکە باشترین وەڵام بۆ ئەو پرسیارەی پرسیبووم، خۆم بووم، بەڵام دەمویست وەڵامەکەی لە کاك ئەرکوتەوە ببیستمەوە:

- بۆچی ئافرەتان لە مەسەلە سێکسییەکاندا وەك پیاو نین؟ بۆچی کۆمەڵ سەربەستی سێکسی لە ئافرەتان زەوت دەکات؟ لەکاتێکدا پێویستە ئافرەتیش وەکو پیاو چۆنی بووێت و چی بووێت بیکات، وانیە؟ پێویستە ئەوە مافێکی زۆر سروشتی بێت.

ئەم پرسیارە تەبیعەتی کاك ئەرکوتی تێکدا. ئەم بابەتە ئەوەندە پیس بوو کە نەدەکرا ببێتە پرسیاریش، بەڵام چیبکەم لە دەمم دەرچوو.

کە وەڵامی ئەم پرسیارەی دامەوە هیچ سەیری دەموچاوی نەکردم، لەبەر ئەوەی زۆر نائارام بوو بەردەوام وشەکانی دەخواردەوە و ڕستەکانی دەبڕی:

- سێڤدا خان، کۆمەڵە پرسیارێك هەن بێوەڵامن، چونکە ئەوەندە ڕوونن کە پێویستییان بە وەڵام نییە. وا دەزانم ئەم پرسیارەش وایە... بۆ ئەم مەسەلەیە لە دەوروبەرماندا چەندین نموونە دەبینین. ئەمانە بەسن بۆ ئەوەی قەناعەت بە مرۆڤ بکەن و بگرە سەروزیادیشە، بەڵام با ئێمە چەند شتێك هەر بڵێین:

ئازادییەکی بێیاسای سێکسی بۆ پیاو بێت یان ئافرەت لەڕاستیدا نەك ئازادی نییە بەڵکو کۆیلەییە و وەحشیەتە. ئازادی بێسنوور مانای دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ئازادی و بەختەوەری و ماڵی خەڵکی دیکە.

له بازنەی حەلاڵدا ڕێگە بە سەربەستی سێکسی دراوە. ئەمەش بە ژیانی خێزانی دەستەبەر دەبێت، ئەگەرنا لەژێر ناوی سەربەستی سێکسیدا چەندین کەسی بێهێز و بێکەس و بێ تاوان زەرەرمەند دەبن. گەورەترین زیانی بیرۆکەی (سەربەستی سێکسی) ئەو پەستانەیە کە دەیخاتە سەر لایەنی دەروونی مرۆڤ، چونکە ئەم بیرۆکەیە خۆشەویستی مرۆڤ لە ڕیشەوە هەڵدەکەنێت و، دوورە لە هەموو پێکەوەبوونێکی سۆزداری و لەبەرامبەریشدا پێکەوەبوونێکی کاتی و درۆینە دروست دەکات؛ کە دەبێتە مایەی نائارامی بۆ هەردوولا.

سەرەڕای ئەوەی کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین نەخۆشی مەترسیدار و دیاردەی ناباو، لە پێش هەموویانەوە نەخۆشی ئایدزو هەموو نەخۆشییە زوهرییەکان و دەستدرێژی و تاوان و خۆکوشتن و ئالودە بوون بە ماددە سڕکەرەکانەوە.

ڕەشەبای (سەربەستی سێکسی) لە خۆرئاوا وەکو تاعون چەندین کێشەی بڵاوکردەوە. ئافرەتە ئەمریکیەکان ناچار بوون پشتی ئەو ڕایە بگرن کە دەڵێت: "(سەربەستی سێکسی) دەمامکێکەو دەیەوێت مرۆڤەکان و بەتایبەت ئافرەتان بکاتە کۆیلە". لە خۆرئاوا شڵەژانی ڕاستەقینە لە ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابردوودا دەستی پێکرد.

هەموو ئەو نەخۆشیانە لە ئەنجامی پێکەوەبوونی ڕێگەپێنەدراوەوە سەریان هەڵدا. خۆرئاوا ئێستا زۆر شڵەژاوە... لەترسی نەخۆشیە درم و گوازراوەکان ژیانیان لێ تاریك بووە، ملیۆنان کەس لە وڵاتانی خۆرئاوا بەدەست ئەم حاڵەتە دەروونیەوە دەناڵێنن...

ڕاستییەکی تر هەیە لە مەسەلەکەدا: (سەربەستی سێکسی) زیانەکانی زۆرتر لەسەر ئافرەتە وەك لە پیاو. چونکە ئەگەر بەراوردی بکەین، ئافرەت لەم بابەتەدا زۆر لە پیاو زیاتر دەفەوتێنێت.

(سەربەستی سێکسی) زیانەکانی بۆ سەر تاك لە ئافرەتدا زۆر زیاترە وەك لە پیاو، چونکە پیاو چۆن دەیەوێت وا دەژی و دوای ئەوە دەتوانێت ئافرەتەکە بەجێبهێڵێت و بڕوات. بەڵام ئایا ئافرەت دەتوانێت ڕابکات و ڕزگاری ببێت؟ بۆ هەرکوێ بچێت لەژێر گوشاری دەوروبەریدا دەبێت. بەردەوام وەك (ئافرەتێکی خراپ) سەیردەکرێت، هەموو جێهێشتنێك بۆ ئەو دەبێتە هۆی ڕووخانی ڕۆحی. بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسیش ژیانی ئافرەت لە ژێر (سەربەستی سێکسی)دا بە بەڵا ناودەبات و بەم شێوە جوانە باسی دەکات:

"ئەگەر پیاو لەپێناو لەزەتێکی هەشت دەقیقەییدا تووشی کارێکی خراپ ببێت، ئەوا چەند لیرەیەك زیانی لێ دەکەوێت، بەڵام سزای لەزەتێکی هەشت دەقیقەیی ئافرەت، کۆڵێکی قورسی هەشت مانگی و، ئەرکی پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵێکی بێ کەسە بۆ ماوەی هەشت ساڵ. واتە ئافرەت لە خراپەکاریدا بە پیاو ناگاتەوە، بەڵام تۆڵەی خراپەکارییەکەی چەندین جاری تۆڵەو سزای پیاوە."[1]

لەڕاستیدا دروشمی (سەربەستی سێکسی) بۆ ئافرەتان، نەك ئافرەت بەختەوەر ناکات، بەڵکو بەرەو ئاقاری خراپتری دەبات.

---

١- بریسکەکان" بریسکەی بیست و چوارەم".

پێش هەموو شتێك ئامانجی (سەربەستی سێكسی) زۆر هێنانە بۆ پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت و تێكدانی خێزان و كۆمەڵە. كە ئەمە بۆ ئافرەت كارەساتە، كارەساتێكی مەعنەوی ئەوەندە گەورەیە كە ئافرەت بەدەستی خۆی خۆی دەكێشێتە ناویەوە، هەمووشمان دەزانین كە ئافرەتێك چەقییە لیتەوە چەندە هەوڵ بدات زیاتر دەچەقێت و بشیەوێت دەربچێت ناتوانێت. زۆربەی كاتیش بە خۆی و منداڵەكەی دەستییەوە فڕێ دەدرێتە دەرەوە یان لە ناو كۆمەڵدا مۆری (ئافرەتیی پیس)ی لێدەدرێت و لێی نابێتەوە. گەورەترین زیانی ئەم بیرۆكەیەش ئەو منداڵانەن كە فڕێ دەدرێنە سەر جادە و كۆڵان.

ڕۆژ نییە لە بەردەم دەرگایەك یان حەوشەی مزگەوتێك یاخود چۆڵەوانییەكدا منداڵێكی فرێدراو نەدۆزرێتەوە. دەتوانین بڵێین زۆربەی زۆری ئەوانەش (میوەی عەشقە قەدەغەكانن) و بە پەیوەندییەكی ڕێگەپێنەدراو(ناشەرعی) لەدایك بوون.

گەورەترین ئازادی و سەربەستی ئافرەت ئەو ژیانە حەڵاڵەیە كە لە چوارچێوەی خێزانەكەیدا دەژی. لەوێ خیانەت نییە، نییەتی خراپی تێدا نییە، بەڵكو ژیانێكی بەهەشت ئاسایە. هەست بە دڵخۆشییەكی ڕاستەقینە دەكات لەگەڵ مێرد و منداڵەكانی خۆیدا. ئەگەرنا لەژێر ناوی (سەربەستی سێكسیدا) بە بەردەوامی دەبێتە خۆراكی دەستی مرۆڤە هەلپەرستەكان و دواییش فڕێ دەدرێتە سووچێكەوە. ئەمەش ئەوەندە نموونەی پڕئازاری هەیە كە لە ژمارە نایەن.

قسەكانى زۆر ڕاستبوون. يەكێك لەو قوربانيانەش من بووم، لە كاتێكدا چاوەڕێ بووم بمكەن بە تاجى سەرو سوڵتان و ناوبانگم هەبێت، كەوتمە ژێر پێيانەوە. ئێستاش لە سايەى سەرى ئەم مرۆڤە چاكانەوە نەبووايە دەمێك بوو خۆم كوشتبوو، ئەوكات هەم ئەم دونيام و هەم ئەو دونياشم لە دەست دەچوو.

خوايەگيان!... سوپاسى بێ پايان بۆ تۆ... منت لە لێوارى لەناوچوون گێڕايەوە و لە سزايەكى هەميشەيى ڕزگارت كردم.

## بۆچى تا دەوڵەمەندى زياد بكات بەختەوەرى خێزان كەم دەبێتەوە؟ بۆچى ڕێژەى تەڵاق لە زياد بووندايە؟

– لەم ڕۆژانەدا لە بەرچاوماندايە كە نائارامى و شەڕو ئاژاوەى نێو خێزانەكان ڕووى لە زيادبوون كردووە. تەڵاق و جيابوونەوە وەك خوو و عادەتى لێهاتووە. ئەمە لە كاتێكدايە دەبووايە لەگەڵ بەرزبوونەوەى ئاستى بژێوى و زيادبوونى دەوڵەمەندى، بەختەوەريش زيادى بكردايە. كەچى وانيە. بە ڕاى ئێوە هۆكارى ئەمە چييە؟ بۆ ئەوەى خێزان ببێتە لانكەى بەختەوەرى دەبێت چى بكرێت؟

لەڕاستيدا ئەم پرسيارەم لەبەر خۆم نەكرد، بەڵكو ئەو ژمارە زۆرەى تەڵاقم دەبينى لە دەووروبەرمدا و لەبەر ئەوان پرسيارم كرد و دەمويست هۆكارەكەى بزانم. ئەگەرنا من بەتەما نەبووم لەمەوبەدوا بەدواى خێزانێك ياخود بەدواى ڕێگاكانى بەختەوەريدا بگەڕێم. بەم حاڵەمەوە كێ بەمن

ڕازی دەبوو؟ خەیاڵە جوانەکانی وەك ئۆتۆمبێل و زەماوەند و پۆشینی بەرگی بوکێنی لەڕابردوودا بەجێ مابوون.

کە کاك ئەرکوت منی بەو حاڵەوە بینی زۆر نیگەران بوو. سەیرم کرد شەیدا و پوورە هاجەریش دڵیان پڕبووبوو و فرمێسك بەری چاوی گرتبوون. هەموویان زۆر باش بە حاڵی منیان دەزانی و زۆر دڵیان پێم دەسووتا.

کاك ئەرکوت کتێبی بریسکەکانی دەرهێنا و دەستی کرد بە خوێندنەوە و باس کردن:

"ئاسوودەیی هەر خێزانێك پەیوەستە بەو متمانەیەی لە نێوانی ژن و مێرددایەو بەو ڕێز و حورمەتەی لە نێوانیاندایە و بەمانە بەردەوام دەبێت."[1]

ئەوەی بەدیعوززەمان باسی کردووە دەتوانین بەم جۆرە لێکدانەوەی بۆ بکەین:

کەسێك حەق و ماف نەزانێت و بیر لەوە نەکاتەوە ڕۆژێك لەبەردەم خودای گەورەدا پەرێشان دەبێت. دەکرێت ستەم بەرامبەر هەموو کەسێك بکات و ببێتە هۆی نائارامی و سنووری خۆی ببەزێنێت.

کەسێك پەروەردە نەکرابێت و نەفسی بەرەو فێرعەون بوون چووبێت و بووبێتە کۆیلەی ئارەزووەکانی، دەکرێت هەموو جۆرە خراپەیەك بەرامبەر دایك و باوك و هاوسەر و منداڵەکانی بکات و لە پێناو بچووکترین ئارەزوویدا ئەوان لەخۆی بڕەنجێنێت.

---

١- بریسکەکان، "بریسکەی بیست و چوارەم".

ئەوانەی قاچیان لە دوای دونیا گیراوە و پێوەری نرخ و بەهایان لە قاڵبێکی مادییدا لا بچووك بووەتەوە، لەوانەیە لەبەر خاتری شتێکی بێنرخ و بچووك چەندین شاخی گەورە برووخێنن.

لە کاتێکدا هەموو تاکێك لە کۆمەڵدا بەدوای بردنەوەدا ڕابکەن تەنیا پێشبڕکێ ڕوودەدات و شتێك بەناوی (بەختەوەری) لە ڕووی ئەو کۆمەڵەدا ناخوێنرێتەوە. لەکاتێکدا ئەمە وا نییە، لەم ڕۆژەدا گرنگ نییە بەهێزبیت یان بێهێز، گرنگ ئەوەیە لە کاتێکدا مافی بێهێز لە بەهێز سەنرایەوە و لە بەرامبەریدا سزایەکی زۆر قورس درا بێهێز نەبیت.

مرۆڤ ، نابێت لەبیری ئەوەدابێت کە براوە بێت، بۆچی بەختەوەری لە کۆمەڵێکدا نەبێت کە ئافرەت خانمێتی خۆی بۆ پیاو بکات و پیاویش ئەو مافانەی ئافرەت کە لەسەریەتی بیهێنێتە جێی خۆی و فەزڵی ڕازیکردنی دڵی هاوسەرەکەی بدات بەسەر هەموو شتێکدا.

کاتێك مرۆڤەکان خۆشەویستی و ڕێزی هاوسەرەکەیان دەگۆڕنەوە بە شتێکی بچووکی دونیایی ئەو کاتە بەختەوەری دەتوێتەوە و نامێنێت.

ئەو وتانە چەندە ناوازە بوون، بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان ئەم ڕاستییانە نابینن. خۆم وەڵامی ئەم پرسیارەم دایەوە. ئایا تۆش ئەمانە دەبینیت؟ مانای وایە پێویستیمان بەو کۆمەڵ و دڵە فیداکارانەیە کە ڕێی مرۆڤەکان ڕۆشن دەکەنەوە.

## بۆچی پێویستە خانمان بالاپۆش بن؟

– بیروباوەڕ و ترسان لە خوا لە دڵدایە، وانییە؟ مادەم ئەمانە لە دڵ و عەقڵی مرۆڤدا بن، کەواتە چ پێویست بەوە دەکات خۆمان بپێچینەوە، چ

پێویستییەك بە باڵاپۆشی هەیە؟ مرۆڤ بە باڵاپۆشییەكەی نا بەڵكو بە دڵی باوەڕ بە خوا دەكات و گوێڕایەڵی دەكات.

- ئەم لێكدانەوەیەی تۆ لەوانەیە لە سەرەتادا ڕاست بێتە بەرچاو، ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە وادەزانن لەچكیش پارچە پەڕۆیەكی ئاساییە، ئەمە لە كاتێكدا باڵاپۆشی بۆ خانمان زیاد لەوەی داپۆشەرێك بێت، كۆمەڵە هەستێك دروست دەكات كە كاری كردووەتە سەر ڕۆح و هەست و بیروباوەڕی.

وەك بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی دەڵێت:

"شەرمنی و پۆشتەیی كارێكی سروشتی یە بۆ ئافرەتان و سروشتیان داخوازیەتی، سەرەڕای ئەوەش ئافرەت لە سوكایەتی و بەدرەفتاری و زەلیلی و دیلی مەعنەوی و نزمی دەپارێزێت".

ئاشكرایە كە مرۆڤ لە ڕوانینی ئەوانەی خۆشی ناوێن، بێزار دەبێت ، خۆ ئەگەر وادابنێین ئافرەتێكی جوان حەز بكات دوو سێ كەسی نامەحرەم بیبینن، هەر ئەو ئافرەتە- بێگومان- لە سەیركردنی حەوت هەشتێكی تری نامەحرەم وەڕس و بێزار دەبێت، بەڵكو نەفرەتیشیان لێدەكات.

كەواتە ئافرەت، بە مەرجێك ڕەوشتی تێك نەچووبێت، بێگومان لەدەست ئەو تێڕوانینە چەپەڵانە هەڵدێت.

بەدیهاتنی ئافرەتان، بە ڕاستی و تەواوی، بۆ خۆپاراستن بێداریان دەكاتەوەو، بۆ پۆشتەیی هانیان دەدات، تاكو ئارەزووی نامەحرەم نەبزوێت و، ئەم پۆشتەییە نەهێڵێت دەستدرێژی بكرێتە سەریان و،

سروشتیان ڕێنماییان دەكات بۆ ئـەوەی كـە قـەڵای مەحكـەم و سـەنگەری ئەمین و بێوەی بۆ ئەوان تەنیا (پۆشتەیی)یە"[1].

لـە ڕاسـتیدا مـرۆڤ بـە بیسـتنی ئـەم ڕاسـتییانە دڵخۆش و ئاسـوودە دەبێت. ئێمە كە باسی باڵاپۆشیمان لا كراوە یەكسەر بیرمان چـووە بـەلای چەند مەترە قوماشێكدا، لەكاتێكدا حیجاب پارچەیەكی جیانـەكراوەی ڕۆح و جەستەیە.

## ئایا هاوڕێیەتییەكی پاكی نێوان كوڕو كچ گونجاوە؟

– خێزانە باوەڕدارەكان، بە توندی دژی هاوڕێیـەتی نێـوان كـوڕ و كچـن. كـچ و كـوڕ بـۆ یـەكتر بـە خێـو نیشـان دەدەن. وا نیشـانیان دەدەن كـە بەرامبەرەكەیان درندەیەكە و قەپی پێدا دەكات. لەكاتێكدا كوڕە و كچ... هەردووكیان ئیرادە و ویستیان پێدراوە. ناكرێـت ئـەم دوو كەسـە پێكـەوە هاوڕێ بن؟ ئەگەر لە ئەنجامی پێكەوەبوونیان دڵخۆش دەبـن ئـەی بۆچـی دژیان دەوەستن؟ مەبەستم ئەوەیە بۆچـی ئـەم پێكەوەبوونـە پاكـە تـاوان بێت؟

كاك ئەركوت زۆر دڵگران بـوو بـە پرسـیارەكەم، حـاڵێكی هـەبوو وەك ئەوەی پێم بڵێت: (ئەوە تۆ هێشـتا دەرسـت وەرنـەگرتووە وا پرسـیارێكی لەو جۆرە لە من دەكەیت؟!) ڕاستی دەكرد، مـن هـیچ مـافی ئـەوەم نـەبوو ئەو پرسیارە بكەم. دواتر زۆر پەشیمان بوومەوە لەوەی پرسیم. ئایا هـەر ئەو حاڵەی كە منی تێدا بـووم ڕوونكردنەوەیـەك نـەبوو بـۆ ئـەو پرسـیارە؟

---

١– بریسكەكان، "بریسكەی بیست و چوارەم".

دوای ئەو هەموو ڕووداوە چۆن دەمتوانی بەرگری لە هاوڕێیەتی پاکی کوڕ و کچ بکەم؟

بەڵام دووبارە ئەو، وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت، دەستی کرد بە وەڵامدانەوە:

– بڕوانە سێڤدا خان! با یادەوەرییەکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە. لە قۆناغی ئامادەییدا هەموو کچەکانی دەوروبەرم هاوڕێی کوڕیان هەبوو. من خۆم شایەتی ئەو ئازارو ناڕەحەتییە بووم کە ئەوان دووچاری بوون. لەو بێزاری و دڵناخۆشییەی ئەوان پەندم وەرگرت. لەبەر ئەوەی باوەڕدار بووم کچەکان منیان زۆر خۆشدەویست. زۆرجار دەهاتن دەردەدڵی خۆیان لای من دەکرد و داوای یارمەتییان لەمن دەکرد. ڕاستتر ئەوە بوو کە کاتێك بێچارە دەمانەوە، لە کەسێکی من واتا لە ئیسلامدا بەدوای چارەسەردا دەگەڕان.

هاوڕێیەکم هەبوو لەسەر مێزێك دادەنیشتین. زۆر جوان نەبوو، بەڵام بە قسەی خۆی کوڕێکی زۆر قۆزی دۆزیبوویەوە. بەڵام ئەو کچە داماوە زۆر ئازاری دەچەشت، بۆ ئەوەی خۆی بۆ کوڕەکەی هاوڕێی جوان نیشان بدات ڕێ نەمابوو نەیگرێتەبەر.

دەیوت: "ئەم هاوڕێیەتییە خێری بۆ من تیانییە. زیاد لە ڕادە پەیوەست بووم پێیەوە، بەڵام ئەو ڕۆژێك بەم حاڵەمەوە بەجێم دەهێڵێت. باشە من ئەو کاتە چی بکەم؟ کە بیری لێ دەکەمەوە وەختە شێت بم".

هاوڕێکەم لەو پەیوەندییە خۆشحاڵ نەبوو وەك دەڵێن: "ئەو خۆشییەی کە لە خۆشەویستییەکی حەرامەوە وەردەگیرێت وەك

هـەنگوینێكی ژەهـراوی وایـە، پـڕە لـە چـەندین ناخۆشـی وەك ئێرەیـی و ئازاری دووری و نەبینینەوەی هەمان هەست لە بەرامبەردا".

پێی دەوتم: "ئێرەیی بە تۆ دەبەم ، چەندە بەختەوەریت. هـیچ ئـازار ناچێژیت. نە ترسی ئەوەت هەیە بەجێت بهێڵن و نە لە ئەندێشەی ئەوەدای كە خیانەتت لیٚ بكەن. خۆزگە ئێمەش بمانتوانیایە وەك تۆ بین".

منیش دەموت:

خوشـكەكەم، چـێژی ڕاسـتەقینەو لـەزەتی بـیٚ ئـازار و دڵخۆشـی بـیٚ كـەدەر و ئاسـوودەیی لـە ژیانـدا تـەنیا لـە باوەڕدایـە و لـە بازنـەی حەقیقەتەكانی باوەڕدا دەدۆزرێتەوە. ئەگەرنا چـێژی دونیـایی زۆر ئـازاری تیایە. دەنكۆڵە ترێیەكت دەداتیٚ و دە زللەت لیٚ دەدات، چێژی ژیان لەناو دەبات.

كەسـێك بـە پـەروەردەی قورئـانی خـۆی لـە تاوانـەكان بپارێزێـت، لـە ژیانیـدا ئاسـوودە دەبێـت، چـونكە بازنـەی حـەڵاڵ فراوانـەو، بەسـە بـۆ تێركردنی ئارەزوو، پێویست بە چوونە ناو تاوان نییە.

هەرگیز بیرم ناچێت. هاوڕێیەكم هـەبوو بـەناوی (سـاینور). زۆر جـوان بوو، لە كۆتاساڵی ئامادەییدا دەستی دابووە خواری و هاوڕێیەتی یەكێكی دەكرد. بەڵام ئەو هاوڕێیەتییـە زۆری نەخایانـد، هـاوڕیٚ كوڕەكـەی بـەجێی هێشت. ئەوەندە تووشی ناڕەحەتی بوو ویستی خـۆی بكوژێـت. بـەردەوام لەسـەر زمـانی بـوو دەیـوت: "چـۆن دەبێـت بـەم جوانییەمـەوە بـەجیٚ بهێڵرێم". شادەماری دەستی خۆی بڕی ، تا گەیەنرایە نەخۆشخانە خەریك بوو بمرێت.

چونکە نەیتوانی ئەو نیعمەتی جوانییە بە پاکی بپارێزێت، کردییە ئازار و نارەحەتی بەسەر خۆیەوە. لە ژیانی هاوسەریشیدا ئاسوودە نەبوو. بەزۆری ئەو کچانەی دڵداری دەکەن، ئەوەی چاوەڕێی دەکەن لە هاوسەرەکانیان دەستیان ناکەوێت، بەردەوام چاویان بەشوێن هاوڕێ پێشینەکانیانەوەیەو دەڵێن: "خۆزگە هاوسەرێتیمان لەگەڵ ئەواندا بکردایە". ئەمەش ڕێگرە لە بەختەوەری.

چونکە ئەو هەستی خۆشەویستییەی پێتان دراوە بۆ ئەوەیە کە لە ڕێگەی ڕاستدا بەکاری بهێنن نەك بۆ خۆشەویستییە کاتییەکان، بەڵام ئەگەر ئێوە بێن و ئەو خۆشەویستییە لە جێگایەکی ناشایستەدا سەرف بکەن، بەردەوام لە ئازاردا دەبن. ئەمە لەبەر ئەوەیە کە هەندێك لەو خۆشەویستانە بێ ئەوەی خوداحافیزیشتان لێ بکەن پشتتان تێ دەکەن و دەڕۆن، هەندێکیشیان خۆشیان ناوێن. خۆشیشیان بوێن هیچ سوودیان نییە بۆتان. دواتریش جگە لە کۆڵێك بێ ئومێدی و جیابوونەوە هیچتان بۆ نامێنێتەوە. وەرە ئەو هەموو خۆشەویستییە بشارەوە بۆ ئەو کەسەی لە ئایندەدا هاوسەرێتی لەگەڵ دەکەیت و ئاسوودە ببە.

## ئەو عەشقانەی لە بازنەی حەرامدان کاتی و پڕئازارن

زۆر بە ئاگاییەوە گوێم بۆ کاك ئەرکوت ڕاگرتبوو...

- دەمەوێت ڕووداوێکی ترت بۆ بگێڕمەوە.

لە قوتابخانەی بنەڕەتی مامۆستایەکمان هەبوو. کچێکی جوان بوو. جوانییەکەی خۆی بەکارهێناو کوڕانی زۆری لە خۆی کۆکردبووەوە،

تەنانەت زۆربەی کات لەبەر ئەوەی لەگەڵ هاورێ کوڕەکانیدا دەچووە دەرەوە ئێمە وانەکانمان دەفەوتا.

مامۆستاکەمان ڕۆژێك ئەفسەرێکی سەربازی بەرزی ناسیبوو، بڕیاریان دا ببنە هاوسەری یەکتری، بەڵام ئەو ئەفسەرە کە لە ڕابردووی مامۆستاکەمانی کۆڵیبوویەوە، لە هەرکەسێکی پرسیبوو وتبووی هاوڕێی کوڕی زۆربووە. ئەویش یەکسەر پەشیمان بوویەوە.

بەم ڕووداوە مامۆستاکەمان تووشی شۆك بوو، لەبەرئەوەی نەیدەتوانی ئەو ئەفسەرە لەیاد بکات، ئیتر لەگەڵ کەس هاوسەرێتی نەکرد. بەدرێژایی تەمەنی تەنیا مایەوە. بەردەوام بە پەشیمانی و ئازارەوە دەژیا.

لەبەر کێشەو ڕووداوی لەم جۆرە بەرەنگاری هاوڕێیەتی کچ و کوڕ دەبینەوە. بەدڵنیاییشەوە تاوانەکانیشیان لە ئەستۆی خۆیانە. چەندین کچ بەهۆی ئەم هاوڕێیەتییەوە بە هیلاك دەچن، ئازار دەچێژن یان لەژیانی هاوسەرییاندا دڵخۆش نابن.

لە هەموویشی گرنگتر هاوڕێیەتی کوڕان و کچان ڕێخۆشکەرە بۆ چەندین پەیوەندی ناشەرعی. لەدەرئەنجامیشدا بەڵایەکی زۆر چاوەڕێی کۆمەڵ دەکات. هەر لەو منداڵانەوە کە لە سەرجادە بەجێ دەهێڵرێن تا چەندین دەردی وەکو ئایدز...

دەمزانی من مافی ئەوەم نییە ئەو پرسیارانە بکەم، بەڵام مێشك و دڵم ئەوەندە لەکە و پیسی تێدابوو دەمویست هۆکاری هەموو ئەوانە دەربخەم و بەتەواوی دڵنیا ببم.

## بۆچی دایکم ئەو نەخۆشییەی چەشت؟

خەیاڵ بردبوومیەوە بۆ کاتی منداڵیم... دایکی خۆشەویستم هاتەوە پێش چاوم. دایکی ڕەحمەتیم زۆر نەخۆش و پەرێشان بوو. ڕۆژێکی خۆشی نەدی.. خۆشیی ناو خێزانی نەبینیبوو ئەو دایکە بێچارەیەم کە لەگەڵ پیاوێکی تێنەگەیشتوو و سەرخۆشدا ژیا. بەردەوام لەناو ئازار و ئاخ و ئۆفدا بوو. ڕۆیشت بێئەوەی ڕۆژێك بەئاسوودەیی بژی...

– کاك ئەرکوت، دایکم کەسێکی زۆر چاك و دڵپاك بوو، بەڵام بەردەوام نەخۆش بوو، ئازاری دەچەشت، بۆچی خوای گەورە نەخۆشی ئاوا دەدا بەسەر ئەو کەسانەدا کە خۆشیان دەوێت و گوێڕایەڵی دەکەن؟ ئایا ئەمە پێچەوانەی بەزەیی و سۆز و شەفەقەت نییە؟ لە کاتێکدا چەندین کەسی تر هەن نافەرمانی خودا دەکەن و شایەنی نەخۆشین.

– سێڤدا خان، نەخۆشی ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ مرۆڤ تا خۆی بناسێت و، تێبگات و، بەندایەتی خۆی بزانێت و، مردنی بیر بکەوێتەوە.

"مرۆڤ بۆ ئەوە نەهاتووەتە دنیا کە ژیانێکی ئاسوودە و نەرمونیانی تێدا بباتە سەر، ژیانێکی وا کە لەهەموو لایەکەوە سروەی حەوانەوە و خۆشگوزەرانیی بەسەردا هەڵبکات، بەڵکو کاتێك هاتووەتە ئەم دنیایە، دەسمایەیەکی پێ دراوە کە بتوانێت ژیانێکی خۆشی نەبڕاوەی پێ دەستە بەر بکات، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین ڕێی بازرگانی بۆ ئاسان کراوە.

جا ئەگەر نەخۆشی نەبێت، ئەوا بە هۆی تەندروستی و خۆشحاڵییەوە مرۆڤ لە خوای گەورە بێئاگا دەبێت و، جیهان لە بەرچاویدا ڕازاوە و بە تام دەردەکەوێت و هەمیشە لەدڵیدا دەبێت، بەڵام نەخۆشی لە خەوی بێ

ئاگایی چاوی پێ دەکاتەوەو پێی دەڵێت: ( تۆ مردنت لە ڕێدایە و هەرگیز جڵەوت بۆ شل نەکراوە، بەڵکو ئەرك و فەرمانبەرییەکت خراوەتە ئەستۆ...)

کەواتە سکاڵای لە دەست مەکە! بەڵکو پێویستە بەرەو سێبەری حەوێنەری سوپاس کردن هەنگاو بنێیت خودای پەروەردگار کە بەرگی جەستەی لەبەر کردوویت و، ئەو پۆشاکەی بە چەند هەستێکی تیشکدارو ڕووناکی وەك ژیری و چاو و گوێ و... هتد ڕازاندووەتەوە، ئەو خودایە، دەیەوێت نەخشە ڕەنگینەکانی ناوە جوانەکانی خۆی بە هەموو شێوەیەك لە پێشانگای بوونەوەردا دەربخات...

هەروەك بەهۆی برسێتییەوە لە ناوی(الرزاق)ی خودا تێدەگەیت و (ڕۆزیدەریی)ی ئەوت بۆ دەردەکەوێت، بە هەمان شێوە لە ڕێگای (نەخۆشی)یەوە ناوی (الشافی) ی ئەوت بۆ دەردەکەوێت و لێی تێدەگەیت، نەخۆشی بۆ هەندێك کەس دەبێت بە گەنجینەیەکی گەورەو دیارییەکی بەنرخی خودایی. هەموو نەخۆشێکیش بۆی هەیە نەخۆشیەکەی خۆی لەو جۆرە نەخۆشیانە بژمێرێت.

نەخۆشی بێئاگایی مرۆڤ دەڕەوێنێتەوە و هەمیشە یادی ڕۆژی دوایی لە هۆش و دڵ و دەروونیدا ئامادە دەکات. تەنانەت هەندێك جار نەخۆش لەماوەی بیست ڕۆژی نەخۆشیدا هێندە سوود و قازانجی زۆری دەستدەکەوێت کە نەتوانێت بە ئاسانی لە ماوەی بیست ساڵدا بە دەستی بهێنێت! هەروەها نەخۆشی خۆشەویستی زیاد لە پێویستی دنیاو پەیوەندی توندو تۆڵی مرۆڤ بە دنیاوە کەم دەکاتەوە، ڕادەی تاڵی و

ئازاری لێکدابڕان و جودابیش لەدڵی ئەهلی دنیادا سووك و کەم دەکات کاتێك کە دنیا بەجێ دەهێڵن، تەنانەت هەندێ جار ئەو لێکدابڕانەیان لە لا خۆشەویست دەکات.

هەموو شتێك بەهۆی دژەکەیەوە دەناسرێت!

ئەگەر ئێش و ئازار نەبوونایە نرخ و تامی (لەشساغی) مان نەدەزانی..

ئەگەر نەخۆشی نەبوایە، بایەخمان بە (تەندروستی) نەدەداو بێ تام دەبوو لەلامان.

زۆربەی ئازار و ترس و بیمەکانی (نەخۆشی) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەندێك جار دەبێتە هۆی (مردن) .!

لە کاتێکدا (ماوەی ژیان "ئەجەل" ئەندازەی خۆی هەیەو، هیچ ئاڵوگۆڕو زیادو کەمییەکی تێدا نابێت) ئەوەتا هەندێ جار ڕووی داوە کە نەخۆش گەیشتووەتە سەرە مەرگ کەچی لە جاران باشتریش چاك بووەتەوە، بەڵام ئەو لەش ساغانەی بۆی دەگریان، ئەوان مردن و ماڵئاواییان لە دنیا کرد!

(نەخۆشی) گرنگترین پەیوەندیدەری ژیانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی فێری نەخۆش دەکات، کە بریتییە لە ڕێزگرتن و خۆشەویستی! چونکە نەخۆشی خاوەنەکەی دەرباز دەکات لەوەی کە لەخەڵکی دوورە پەرێز بێت و پێویستی بەکەس نەبێت و هەر بە تەنیا بۆ خۆی بژی!

تاوانباری نەخۆشی هەمیشەییە لە ژیانی هەتاهەتایی ڕۆژی دواییدا، هەروەك لەم ژیانەی دنیاشدا چەندین نەخۆشی لە دڵ و گیان و ویژدانی مرۆڤدا دروست دەکات.

جا ئەگەر لە کاتی نەخۆشیدا ئارام بگریت و سکاڵا نەکەیت، ئەوا بەم نەخۆشییە کەم خایەن و بچووکە خۆت لە چەندین نەخۆشی زۆر و هەتا هەتایی دەرباز دەکەیت."[1]

ئینشائەڵڵا بۆ دایکیشم بەو شێوەیە بووە. ئینشائەڵڵا ئەو دایکەشم کە لە ژیانیدا خۆشی و ئاسوودەیی نەدیوە شایستەی ئەو سۆز و بەزەییەی خوای گەورە دەبێت...

## خوای گەورە لەو هەموو تاوانە خۆش دەبێت؟!

هەموو ئەمانە ڕاستیگەلێکی زۆر بێوێنە و بەجێ بوون. ساڵانێکی تەمەنم بەبێ ئاگا لەمانە گوزەراند بوو، من ئەوەندەم تاوان و خەتام هەبوو کە سەد جاریش تەوبەم بکردایە باوەڕم نەدەکرد سوودی هەبێت و شایانی لێخۆشبوون بم. واتا ئەو ئومێدانەی تازە بە تازە لە ناخمدا چرۆیان کردبوو نەیاندەتوانی ڕزگارم بکەن. من کەسێکی بێ چارە و فەوتاو بووم.

لەنێو بێئومێدی و ڕەشبینیدا خەیاڵ بردبوومیەوە، کە کاک ئەرکوت و شەیدا ئەم حاڵەمیان بینی وتیان:

– زۆر هیلاک بوویت سێڤدا خان، ئەگەر دەتەوێت تۆزێک پشوو بدە. کاتی زۆرمان دەبێت بۆ قسەکردن.

– نەخێر، هیلاک نیم، بە پێچەوانەوە خەریکە ناخم دەبوژێتەوە. دەڵێی ڕۆحە مردووەکەم تازە دەبێتەوە و بەهێز دەبێت. دۆزینەوەی دونیایەکی

---

١– بریسکەکان، "بریسکەی بیست و پێنج".

ئاوا و گوێگرتن لەم ڕاستیانەو، هەستکردن بە بەندەیی بۆ خوا و چەشتنی چێژەکەی، چەندە خۆشە.

بەڵام من مرۆڤێکم تاوانەکانم ئەوەندە زۆرە، ئەوەندە لەکەدار و پیس بووم کە خودا بە هیچ شێوەیەك لێم خۆشنابێت. لەبەر ئەمە گەشبین و ئومێدەوار نیم، زۆر دڵیش خۆش ناکەم بەم ئاسوودەییەی ئێستا لەناخمدایە.

خێرا کاك ئەرکوت قسەکەی پێ بڕیم و وتی:

– نەخێر سیڤدا خان، ئێوە هەڵە بیر دەکەنەوە، بیرتان نەچێت بەخشندەیی و میهری خودا لە هەموو تاوان و خراپەیەك زیاترە. خاوەنی بەزەییەکە کە لە گەورەترین تاوان خۆش دەبێت، تەنیا ئەوەندە پێویستە کە بەندە بە هەموو دڵیەوە تەوبە بکات و پەشیمانی خۆی ڕابگەیەنێت.

تۆ ئومێدەوار بە. چەندە تاوان و کاری خراپ و هەڵەت ئەنجامدابێت بزانە کە خوایەك هەیە دەتبینێت و دەنگت دەتبیسێت و چاوەڕێی یەکەم هەنگاوی تۆیە لێت خۆشبێت.

ئەو ئومێدە ناخمی گەشاندبوویەوە. وامدەزانی کە یەکسەر خوا لێم خۆشبووە، بۆیە دەستم کردە گریان.

شەیدا هاتە لامەوەو باوەشی پێداکردم. بە باوەشە توندوتۆڵەکەی هێزی وەبەرهێنامەوە. هەوڵی دا دڵم بداتەوە، لەولاشەوە پوورە هاجەر دەیوت:

– ئومێدت بەخوا هەبێت، بزانە گەورەترینی بەندەکان و بەرزترینیان ئەوانەن کە لە هەڵەکانیان دەگەڕێنەوەو، لە گوناهەکانیان تێدەگەن و، ڕوو

دەکەنە خواو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەن. چەندە دڵخۆشییە بۆ تۆ کە خوا دەرفەتێکی ئاوای پێداویت. دەزانیت چی دەبوو پێش ئەوەی ئەم ڕاستییانە بزانیت بمردیتایە؟ ئەو کات ترسی ئەوە هەبوو بۆ هەتاهەتایی لە دۆزەخدا بیت، بەڵام ئێستا ئێمەش لەبەردەم خوادادا شایەتی ئەوە دەدەین کە تۆ لە هەڵەکانی ڕابردووت پەشیمانیت.

بەڵێ زۆر پەشیمان بووم، زۆر شەرمم دەکرد، زۆر تەریق دەبوومەوە، زۆر بچووک بوومەوە. ئەگەر گریمانی یەك لە ملیاریش هەبێت بۆ ئەوەی خوای گەورە لێم خۆش بێت هەر خۆشحاڵم.

## کۆمەڵە وەڵامێکی نایابی لە پەیامەکانی نوور خوێندەوە

وەڵامەکانی منی سەرسام کردبوو. تا ئەو ڕۆژە هیچ شتێك ئەوەندە کاری تێنەکردبووم... دەتوت بردوومیەتە دنیایەکی ترەوە، پاکی کردبوومەوە و هەموو چڵکەکانی لێکردبوومەوە. تینوێتی ڕۆحم و ناڕەحەتییەکانی نەهێشتبوو.

لەوانەیە هاوشێوەی ئەمانەم پێشتر لە دایکم و پوورە هاجەرەوە گوێ لێ بووبێت. بەڵام وەك ئەمانە نەبوون. لەوانەیە هی ئەوەبێت کە زۆر پێویستم پێی هەبووبێت وا ئەوەندە کاری تێکردم.

کۆمەڵە هەستێکی ئەوەندە جوان و پاك و خۆشییەکی وا چووبووە دڵمەوە دەتوت لەم دونیا خنکێنەر و بێزارکەرەدا بەهەشتم دۆزیوەتەوە.

بێ وەستان ئەو پرسیار و گومانانەی مێشکمیان داگیر کردبوو یەك یەك دەڕەوینەوە. لە کۆتاییدا هەستم بەوە کرد کە ئیتر کەسێکم و لەم

دونیایەدا دەژیم. دوای چەند ساڵ بۆ یەکەمجار چێژم لەوە وەردەگرت کە وەك مرۆڤ دەژیم.

هەروەها یەکەمجارم بوو ئەوەندە لە ناخەوە پەشیمان بم ، لەهەموو خانەکانی جەستەمەوە داوای لێخۆشبوون و دەنگی تەوبە بەرز دەبووەوە. ئەو هەستانە ئەوەندە بێ وێنەبوون، وامدەزانی وەك قاڵبێکی سەهۆڵ وام و لەبەردەم خوادا دەتوێمەوە.

ئەو ئاو و هەوا سیحراوییەی کە تا ئەو کاتە پێی ئاشنا نەبووبووم بە تەواوی پەیوەستی خۆی کردبووم، خەریك بوو لە خۆشیدا لەهۆش خۆم دەچووم. لەڕاستیدا مەستبوونێکی مەعنەوی وابوو کە نە ئاگام لەوەبوو فرمێسکەکانم بوونەتە دەریا و نە هۆشم لای هەنسکە نەبڕاوەکانم بوو.

بەردەوام دوعام دەکرد:

– ئەی خوای گەورە ! لێت دەپاڕێمەوە ئەم هەستانە لە ناخمدا کۆتایی پێ مەهێنە. نامەوێت جارێکی تر لە نێو لیتاوی تاواندا نوقم بم. تا مردنم بمگێڕە بە بەندەیەکی شایستەی خۆت.

بە وتەی "کچم؟!"ی پووره هاجەر– کە لە جێیەکی زۆر دوورەوە دەهات– هاتمەوە هۆش خۆم.

هەموو ئەو کەسانەی لەوێ بوون چاویان لەسەر من بوو. هەموو چاویان پڕبوو لە ئەسرین و سەیری شەرمەزار بوونی منیان دەکرد لە حزووری خودادا.

– ئەم وەڵامانە زۆر نایابن، زۆر ڕاستی بێ وێنەیان تیایە. ئەم کتێبانە زۆر کاریگەرن و ڕۆحی مرۆڤ پاراو دەکەن. ئەی باشە بۆچی تا ئێستا ئەم

کتێبانـــەمان نەخوێندووەتـــەوە؟ بۆچـــی تـــا ئێســـتا ســـوودمان لـــێ وەرنەگرتوون؟

- بۆ ئەوەی نەتانتوانیوە ئەم کتێبانە بخوێننەوە لەسـەر حـەقن. لەبـەر ئەوەی لەدەوروبەرتاندا کەسێك نەبووە سودی لەم کتێبانە وەرگرتبێت.

ئـەم کتێبانـە (پەیامـەکانی نـوور) نووسـراوی دەسـتی بـەدیعوززەمان مامۆستا (سەعیدی نوورسی)ن.

ئـەم پەیامانـە، ڕاڤـە و تەفسـیری قورئـانن و نووسـراون کـە بـاوەڕی مرۆڤەکان ڕزگار بکەن .

بەداخەوە ئەم کتێبانەی کە تـا ئێسـتا وەرگێڕدراونەتـە سـەر چـەندین زمـانی جیهـانی و خراونەتـە خزمـەتی مرۆڤایەتییـەوە، لـە وڵاتـی ئێمـەدا نەتوانراوە وەك پێویست بناسێنرێن، یان هەندێك دەیانەوێت خەڵك بەهەڵە لەو کتێبانە تێبگەیەنن.

بڕوانە با نووسراوێکت بۆ بخوێنمەوە دەربارەی خوشکێکمان کە باسی هەستەکانی خۆی دەکات سەبارەت بە پەیامەکانی نوور:

" لەوەتـەی دەسـتم کـردووە بـە خوێندنـەوەی پەیامـەکانی نـوور کەسانی دەوروبەرم پێم دەڵێن کە زۆر گۆڕاوم. کە هۆکـاری ئەمەشـیان لـێ دەپرسم پێم دەڵێن بوویت بە کەسێکی تەواو جیاواز. منیش پێیان دەڵێم: بەڵێ زۆر گۆڕاوم. ئەگەر ڕاسـتتر بڵێم دونیاکـەم گـۆڕاوە. جـاران بـەیانیان هەڵدەسـتام کارەکـانی ماڵـەوەم دەکـرد، منداڵـەکانم بـەڕێ دەکـرد بـۆ قوتابخانـەو دەسـتم دەکـرد بـە چـنین. دواتـر ڕۆژنامـەکانم هەڵـدەگرت و دەمخوێندنەوە. سەیرم دەکرد، ئەو هونەرمەندە ئەو کارەی کردووە، ئـەم

هونەرمەندە ئەم کارەی کردووە. جگە لە هەواڵی مردن و خۆکوشتن و کەتن و کارە ڕەشەکان. ئەمانەش ڕۆحمیان ئازار دەدا، بەردەوام هەمان شت دووبارە دەبوویەوە. ڕۆمانی خۆشەویستی و شتی بێهوودە ڕۆژەکانمیان پڕ دەکردەوە. زۆرجار لەخۆمم دەپرسی: مانای ژیان و ئامانج لە ژیاندا ئەمانەیە؟! تەنیا کارەکانی ناوماڵ و چنین و خوێندنەوەی ئەو هەواڵە دووبارانەیە؟ دەبێ ژیان مانایەکی تری هەبێت، ئامانجێك هەبێت لە ژیان. پێویست دەکات کومەڵە شتێك هەبن مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە، بەڵام ئەوانە چین؟

لەو کاتەدا بوو کە زەمین لەرزەی ١٧ ی ئاب[1]، ڕوویدا لەو کاتەوە ئیتر زۆر بە جددی بیرم لەم بابەتانە کردەوە. ئیتر هەستم کرد کە دەبێ نوێژ بکەم و، دەستم کرد بە نوێژ کردن. بەڵام ئەمە بۆ من بەس نەبوو. دواتر بە(پەیامەکانی نوور) ئاشنا بووم. ئەوکات ئیتر وتم: "ئەمانەن! ئەو کتێبانەی کە بەدوایاندا دەگەڕام و دەبوو بیانخوێنمەوە."... ئێستا فێربووم ئامانج لە ژیان چییە. لە نهێنی ئەوە گەیشتم کە بۆچی دەژیم و مەبەست لە دروستبوونم چییە.

---

١- زەمین لەرزەکەی ١٧ی ئاب یان زەمین لەرزەی مارمارا، ئەو زەمین لەرزەیە بوو کە لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٧ی ئابی(١٩٩٩ ) دا دای لە ناوچەیەکی زۆر لە خۆرئاوای تورکیا. پێوانەی زەمین لەرزەکە ٧.٥ بوو بە پلەی ڕێختەر. لەم زەمین لەرزەیەدا ١٧٤٨٠ کەس گیانیان لەدەست داو ٢٣٧٨١ کەس بریندداربوون و نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەس بێ ماڵ و حاڵ مانەوە، ئەمە جگە لە کاولبوونی زیاد لە ٢٨٥ هەزار جێی نیشتەجێبوون و نزیکەی ٤٣ هەزار دوکان و کارگە.

پلانم بۆ ڕۆژەکانم دانا. تا نیوەڕۆ کار دەکەم، دواتر (پەیامەکانی نوور) دەخوێنمەوە. دوای نوێژی عەسریش، چەوشەن، دوای نوێژی ئێوارەش سوورەتەکانی وەك (یس) و (الملك) دەخوێنمەوە لە قورئاندا. ئێستا ئەو بێزارییەی پێشووم نەماوە. ژیانم مانایەکی دیکەی هەیە؛ جاران کات نەدەڕۆیشت بەڵام ئێستا کات بەشم ناکات.

مرۆڤ بەردەوام بیر دەکاتەوە، باشە من بۆ هاتوومەتە دونیاوە؟ لە کوێوە هاتووم و بۆ کوێ دەڕۆم؟ ئەم دونیایە چییە؟ بۆچی دەژیم؟ لەمەودوا چیم لێ دێت؟ ئەوانەی چوونەتە ژێر خاکەوە بۆ کوێ دەڕۆن؟ بەرەو نەمان دەچن یان دونیایەکی تر هەیە ؟ ژیانی دوای مردن چۆنە؟

مانای ژیان چییە؟ ئەگەر تەنیا خواردن و خواردنەوە بێت و دواتر بڕۆیت و بەجێی بهێڵی ئەی کەواتە بۆچی دروستکراوین؟ ئەو کردگارەی منی دروستکرد بۆ منی ناردە ئێرە؟ و چی لێم دەوێت؟

هەموو مرۆڤێك لەم ژیانەدا ئەم پرسیارانە لەخۆی دەکات. دەیەوێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزێتەوە. چونکە مرۆڤ گیاندارێك نییە پەتی لەمل کرابێت و لە جێگایەکدا بلەوەڕێت. جیاواز لە ئاژەڵان مرۆڤ کرۆکێکی گرانبەهای وەك عەقڵی پێ بەخشراوە. مرۆڤ لە سایەی ئەو کرۆکەوە، پرسیارگەلێکی وەك (من چیم؟ لە کوێوە هاتووم؟ بۆ کوێ دەڕۆم؟) دەپرسێت .

لەبەر ئەوەشە ئەو زاتەی مرۆڤەکانی ڕەوانەی دونیا کردووە، چەندین ئامانجی گرنگیشی پیشانداوە. ئەوی نەناردووە تا لە کۆشکی بوونەوەراندا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و هەرچۆن پێی خۆشە بژی. مرۆڤ مەبەست و

ئامانجێکی هەیە. ئەو زاتەی ئەوی بەجوانترین شێوە دروستکردووە و هەموو شتێکی کردووەتە خزمەتکار و خستوویەتییە بەردەستی بێگومان داواکارییەکی لێی هەیە".



# بەشی شەشەم

لەکاتێکدا ڕۆژم دەژمارد بۆ خۆکوشتن، شنەبایەکی
ئەفسووناوی هەڵیکرد. هەرچی لەکەو تاوان و کوفر
بوو لەناخمدا هەمووی ڕامالّی و پاکی کردمەوە.
لەو دونیا پڕ چێژ و خۆشییەدا
سەرم سووڕمابوو. تێگەیشتم کە گەورەترین
بەختەوەری لە بەندایەتیدایە بۆ خوای گەورە.



# سەرم بردە سوجدە و
# دەستم کرد بە گریان



## یەکەمین نوێژ و فرمێسك

ئەو گفتوگۆیەی دونیای منی گۆڕی و سەرلەنوێ ئاسۆیەکی نوێی پیشاندام، تا نزیکی بەرەبەیانی خایاند.

ئەو ڕاستییانەی باسدەکران نوورانی و ئارامیان دروستکردبوو بە جۆرێك کە هەموویانی ئاسودە کردبوو. ژیانم بەتەواوی گۆڕا، ئەو دونیا مەعنەوییەی سالانێك بوو بێ هوودە بە دەرد و غەم پڕم کردبوویەوە، لێوان لێو بوو لە شادی. کەواتە ئەوەی پێی دەڵێن ئاسوودەیی و دڵخۆشی ڕاستەقینە ئەمەیە. منیش ئەو هەموو کاتە لەژێر ناوی (ئاسوودەیی و دڵخۆشی)دا باوەشم بە کێدا کردووە و نەمزانیوە.

لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە دەنگی بانگی بەیانی بیسترا. تا ئەم ڕۆژە هەزاران جار دەنگی بانگم بیستووە، بەلام هیچیان وەك ئەمجارە دڵی نەخستمە جۆش و خرۆشەوە. دەتوت بانگەکانیش جیاوازن.

کاك ئەرکوت و پوورە هاجەر و شەیدا وردە وردە خۆیان بۆ نوێژی بەیانی ئامادە دەکرد.

من لەوجێیەی لێی دانیشتبووم خەریکی ململانێیەکی گەورە بووم لەگەڵ خۆمدا. لە ناخمدا دەموت: "ئەگەر ئەوان مرۆڤ بن منیش مرۆڤم. ئەوان دەژین و منیش دەژیم. ئەوان دەمرن و منیش دەمرم. هەمووشمان لەبەردەم خوای گەورەدا پاداشت و سزای کردەوەکانمان وەردەگرین".

بەڵێ، ئەمە وەك ڕاستییەکی بێوێنە لە مێشکمدا چەسپیبوو. مادام وایە سبەینێ ڕەنگە درەنگ بێت. هەستام بە دەنگێکی گڕ و بە کەمێك شەرمەزارییەوە بە شەیدام وت:

– منیش نوێژ دەکەم.

چاوەکانی لە خۆشیدا دەبریسکایەوە.

– ئای سێڤدا گیان، ئەمە چ هەواڵێکی خۆشە!

بە دڵخۆشییەکی زۆرەوە باوەشی پێداکردم و گوشیمی بە خۆیەوە.

## خۆمم ونکردبوو

ئەوکات خۆمم نەگرت. لەوانەیە ئەو هەموو غەم و پەژارەیە بێت و لە یەك چرکەدا تەقیبێتەوە

– توخوا شەیدا، بەجێم مەهێڵە. من ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ ژیانی پێشووم، دەمەوێت لە دونیای نووردا بمێنمەوە. دەمەوێت تەوبە بکەم. دەمەوێت وەك ئێوە ببمە بەندەی خودا. توخوا یارمەتیم بدە.

ئەویش لەمن تێدەگەیشت و هەستی دەکرد لە چ خۆشییەکدام. ئەویش لە خۆشیدا فرمێسکی دەڕشت. پوورە هاجەریش هاتە لام و سەرمی نا بە سینگییەوە و وتی:

- ڕۆڵە گیان، غەمبار مەبە. ئیتر دەستت لیَ بەرنادەم. تۆ مندالّی ڕاستەقینەی منی، ئەو ڕۆژانە کۆتاییان هات کە تۆیان بە هەدەر دا و ژیانیان لیَ تالّ کردیت. تۆ کە بەهەموو دلّتەوە گەڕایتەوە بۆلای خودا و تەوبەت کرد. وادەزانی ئەو دەستت لیَ بەردەدات؟!

دوای ئەو ژیانە لەکەدارەم، ئەمە یەکەمین نوێژم بوو. لەگەلّ چەند مرۆڤێکی فریشتەئاسا چووبوومە بەردەمی خوای گەورە.

ئای خوایەگیان! ئەمە چ ملکەچییەکی نایاب و چ چێژێکی مەعنەوی بەرز بوو. وامدەزانی هەموو ئەندامەکانی لاشەم هەستاونەتە سەرپیَ و داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن.

دلّم خەریکبوو دەوەستا. بە درێژایی نوێژەکە هەنسکەکانم ڕانەدەوەستان. دەتوت هەموو تاوان و هەلّەکانم وەك ئاو دەچۆڕێنەوە و دەڕژێن. وامدەزانی ملیۆنان تەن کێشی قورس لەناخمدا دەتوێتەوە و دەڕوات.

بە هەموو هێزێکمەوە دەپاڕامەوە: "خوایەگیان! تا کۆتایی تەمەنم لەم بەختەوەرییە بێبەشم مەکە و، بمکە بە بەندەیەکی شایستەی خۆت... ئیتر دەرگایەکی ترم نییە جگە لە دەرگای تۆ. کەسم نییە جگە لە تۆ..."

زۆر بە ناڕەحەتی توانیم نوێژەکە تەواو بکەم. سەرم خستەوە سەر زەوی و بە شێوەیەك دەگریام دەمویست دەروونم تەواو پاکبێتەوە. تێگەیشتم کە خوای گەورە بەختەوەری ڕاستەقینەی لە فرمیسکی ناو سوجدەدا داناوە.

چەندین ساڵە لە جێی تر بەدوای ئاسوودەییدا گەڕاوم. کەچی لە ڕاستیدا گەورەترین ئاسوودەیی لە بەردەم خۆمدا وەستاوە.

شەیدا یەکسەر گرتمیە باوەش.. بە سۆز و میهرەبانییەوە هەڵیساندمەوە، بە دەستەسڕەکەشی فرمێسکەکانمی سڕی.

خوای گەورە چ دۆستانێکی چاکی بۆ من ناردبوو. کە مرۆڤە چاکەکانی ئەم دونیایەم دەبینی، ملیاران جار سەرزەنشتی خۆمم دەکرد. بەڵام خوای گەورە ئەم ڕۆژانەشی نیشاندام. ئیتر پوورە هاجەر دەستی لێ بەرنەدام... نزیکەی هەفتەیەك میوانیان بووم، بە دڵنیاییەوە بەمە نەدەوترا میوانی. ئەو مامەڵەیەی ئەو دەیکرد جیاوازی نەبوو لە مامەڵەی دایك لەگەڵ منداڵەکەیدا. دەتوت من کچی ئەوم و دوای دابڕان و دووری پێم گەیشتووەتەوە. گرنگییەکی زۆریان پێدام .

خوایەگیان ئەمانە چ چاکەیەك بوون لەگەڵم دەکران؟ ئەمە چ پاکییەك بوو؟

باش دەمزانی کە پوورە هاجەر و خێزانەکەی گەورەترین بەخششی خوا و گەورەترین یارمەتیدەرم بوون. خوای گەورە لەو هەموو بەڵاو ناخۆشییە بە موعجیزە منی ڕزگارکردو، سەرەڕای هەموو تاوانەکانم خستمیە بەردەستی پوورە هاجەر. ئەگەرنا دەمێك بوو لەناوچووبووم و، دونیاو دوارۆژی خۆم دۆڕانبوو.

خوایە گیان! سوپاسی بێ پایان بۆ تۆ، بەتەواوی لە لێواری خۆکوشتندا منت گێڕایەوە. ئەگەر تا کۆتایی تەمەنم سوجدەی سوپاسگوزاری بۆ تۆ ببەم لەبەرامبەر ئەم بەخششەدا هێشتا کەمە...

## دووباره گەڕامەوە بۆ ژیان

لەماڵی پوورە هاجەر هەستم بە ئارامی و ئاسوودەییەکی بێسنوور کرد کە لێی تێر نەدەبووم. وام دەزانی لە دۆزەخ ڕزگارم بووە و بەبەهەشت شادبووم.

ئەو خانمە فریشتەئاسایە، بە گفتوگۆو، ئامۆژگاری و، دڵدانەوەکانی منی هێنایەوە سەر خۆم، بە هۆی ئەوەوە دوای چەندین ساڵ هەستم کرد منیش مرۆڤم و لە دونیادا دەژیم.

قسە ئەفسووناوییەکانی ئەو خانمەی کە کاتی خۆی هاتە ماڵمان و داوای پەرداخێك ئاوی لێ کردین ڕاست دەرچوو، چونکە پێی وتم: "خوا سەرەنجامتان بەخێر بگێڕێت".

ئەو ماڵەی کە تێیدا هاتمەوە سەرخۆم و ژیانم بۆ گەڕایەوە و دووبارە گەڕامەوە بۆلای خوا و تێیدا سوجدەم بۆ خوای گەورە برد هی بێگانەیەك بوو. نەیاندەتوانی هەتا هەتایە من لەو حاڵەدا بهێڵنەوە. چونکە ئەگەر منیان بهێشتایەتەوە نەیاندەتوانی ئەوە بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە. لەوانەیە بەهۆی منەوە تووشی کێشە ببونایە، و لەبەرامبەر دەورروبەریاند تووشی شەرمەزاری ببونایە. ئەمە مانای وابوو کە دەبوو ڕێیەك هەڵبژێرم، بەڵام بەرەو کوێ؟ من ئەو دەفتەرە کۆنەم داخستبوو. نەمدەتوانی بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ. کەسیش باوەڕی پێم نەدەکرد. ئەوانەی منیان دەناسی، ئەوانەی هەواڵی منیان بیستبوو کە دەیانبینیم تەبیعەتیان تێك دەچوو.

ئـای خوایـە گیـان! مـن دەبووایـە چـیم بکردایـە؟ دووبـارە بـەرەو بێچـارەیی هــەنگاوم دەنــا، ئــەم بــیرە بــەردەوام مێشــکمی دەخــوارد و خۆشییەکانی لێ تێکدەدام. چونکە چەندە خۆیشیان تێکنەدەن و وا بکەن کە هەستی پێنەکەم بەڵام هەم پوورە هاجەر و هـەم شـەیدا لـە حـاڵی مـن ئاگـادار بـوون، لەسـەروو ئەوەشـەوە منیـان گرتبـووە خۆیـان و باوەشـی میهرەبانییان بۆ کردبوومەوە.

نەمدەویست بەهۆی منەوە تووشی قسەوقسەڵۆك ببن.

## لەوماڵەدا بێگانە بووم

کاتی ئەوە بوو کە لەگەڵ پوورە هاجەر قسەبکەم. ئەو بەیانییـە دوای ئەوەی پێکەوە نانی بەیانیمان خوارد وتم:

– پـوورە هاجـەر، تـۆ بوویـت بـە دایکێکـی ڕاسـتەقینە بـۆم. ئەوەنـدە چاکەت بەسەرمەوەیە ناتوانم باسی بکەم. لێرە وادەزانم لە بەهەشتم. منت بۆ ژیان گێڕایـەوە، دووبـارە گیانـت هێنایـەوە بـە بەرمـدا. بویتـە هۆکـاری گەڕانەوەم ، تامی بەندایەتی خوات پێ چەشتم...

بــەو نوێژانــەی بــە ملکەچــییەکی زۆرەوە دەیانکــەم لــەزەتێکم چەشتووە کە پێشتر هەستم پێ نەکردووە. زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە شـەو تا بەیانی لـە خـوا دەپاڕێمـەوە و داوای لێخۆشـبوونی لـێ دەکـەم. هـەموو ئەمانە لە سایەی تـۆوە بـوو. خـوا بـۆ هەتاهەتایـە لێـت ڕازی بێـت. بـەڵام لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە من لەم ماڵەدا بێگانەم. مافی ئەوەم نییە ئـیتر ئەوەندە ببم بە بار بەسەرتانەوە. نامـەوێت بـەهۆی منـەوە ناڕەحـەت بـن. بۆیە ئەگەر دەکرێت ئیزنم بدەن.

زۆر بە ئاگاییەوە گوێی لێگرتبووم. لەپڕ هەستایە سەرپێ و، چاوی پڕبوو لە ئاو:

- تۆ چی دەڵێیت کچم. تۆ دەتەوێت خۆشەویسترین و شیرینترین منداڵم لەباوەش دەربێنیت؟ جێگای تۆ لە دڵی مندایە...

من تەنها پوورە هاجەری تۆ نیم و بەس، بەڵکو هاوڕێی ڕۆژی دوایی دایکیشتم. تۆ یادگاری ئەویت لای من. وەك کچی ڕاستەقینەی خۆم وایت. ئەگەر لێرە بڕۆیت بێتۆ بەرگە ناگرم. ئەگەر کاری وا بکەیت گەورەترین خراپە لەگەڵ من دەکەیت لە دونیادا.

لەناخی دڵمەوە سوپاسی خوا دەکەم لەسەر ئەوەی تا مردن وەك دایك و کچ دەمێنینەوە لەم ماڵەدا. کەچی تۆیش داوای ئیزنم لێ دەکەیت. بۆ خاتری خوا چۆن دەتوانی ئەمە بکەیت؟! ئەگەر ڕێزو قەدرم هەیە لات ئەو بیرۆکەیە لە مێشکتدا مەهێڵە.

کێ دەتوانێت لەوە زیاتر بەرگەی ئەو خۆشەویستییە قووڵە و ئەو سۆزە بێئەندازەیە بگرێت؟

وەك دایك و کچ باوەشمان کرد بە یەکدا... دووبارە فرمێسکەکانمان تێکەڵی یەکتر بوو، لە ناخەوە هەستم بەو خۆشەویستییە قووڵەی پوورە هاجەر دەکرد. ئەو هەست و سۆزە بەرفراوان و پاك و بێگەردەی سەرسامی کردبووم.

## ئیتر کچی ئەو ماڵە بووم

لەو ماڵەدا مامەوە... پووره هاجەرم بە دایکی خۆم و ماڵەکەیشی بە ماڵی خۆم دانا.

لەلایەك شەیدا و پووره هاجەر، لە لایەکی ترەوە ئەو خانمە شیرین زوبانەی هەفتەی جارێك دەهاتن بۆ ماڵە نوێیەکەم، ئاسۆیان بۆ دەکردمەوە و دڵیان خاوێن دەکردم و باوەڕمیان زیاد دەکرد. دەتوت ئەو ماڵە ماڵێکی ئاسایی نییە بەڵکو قوتابخانەیەکە و لەو قوتابخانەیە پەروەردە دەکرێین.

شەش مانگ تێپەڕیبوو بەسەر گەڕانەوەمدا بۆلای پووره هاجەر. سوپاسی بێپایان بۆ خوا لەو شەش مانگەدا زۆر شت گۆڕابوو. بەتەواوی هاتبوومەوە سەر خۆم. ئەو بیرۆکەو گومانە هەڵانەم ڕەوییبوونەوەو مێشکم و ناڕەحەتیەکانی دڵم یەك یەك وەك سەهۆڵ توابوونەوە. بەتەواوی چووبوومە بەردەم بارەگای پەروەردگار و بە بەخشندەیی و میهری ئومێدم بۆ گەڕایەوە.

لەسەروو هەموو ئەو ڕووداوە سەرنجڕاکێشانەوە نالێم کە ڕۆژەکانی ڕابردووم خەویان لێ نەدەزڕاندم، بەڵام ترس و ماتی بێتاقەتییەکانم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کۆتاییان پێدەهات.

# بەشی حەوتەم



ڕووداوێك ڕووی دا لە منداڵیمەوە بە خەیاڵی ئەوەوە دەژیام. لەکاتێکیشدا کە هیچ ئومێدێکم نەبوو... دەچوومە پرۆسەی هاوسەرێتییەوە، زۆر بەبێدەنگی و بێ ترپە و بێ سەدا... یەکەمجارم بوو نهێنی بەختەوەریم دۆزیبووەوە. خوایەگیان! تا کۆتایی با ئەمە بەردەوام بێت...



## لەکاتێکی چاوەڕواننەکراودا،
## ڕووداوێکی باوەڕپێنەکراو ڕوویدا



### ئەمە چاوەڕوان نەکراوبوو

زەماوەندی شەیدا نزیکبووبوویەوە، لەبەر ئەوەی ماڵیان لە قاتی سەرەوەی ماڵەکەی پووره هاجەرەوە بوو، ئێمەش بەشداربووین لە ئامادەکردنی ماڵەکەدا بۆ ئاهەنگەکە، شەیدا بەهۆی ئەوەی لەگەڵ باوکیدا دەمایەوە، هەموو ئێوارەیەك یان ئەو دەهاتە خوارەوە، یان ئێمە دەچووینە سەرەوە، بەم شێوەیە بووبووینە پشت و پەنا بۆ یەکتری.

ئەو شەوە من و پووره هاجەر دەعوەتی شەیدا بووین:

- ئەم شەو خواردنێکی تایبەتتان بۆ ئامادە دەکەم، باوکیشم لەماڵ نییە. بەیەکەوە دادەنیشین نانێك دەخۆین.

نانەکەمان خوارد و، خەریکی چا خواردنەوە بووین. سەیرم کرد پووره هاجەر و شەیدا ئاماژە بۆ یەکتر دەکەن. وا تێگەیشتم شتێك هەیە یان دەیانەوێت لە منی بشارنەوە یان زۆر گرنگە و دەیانەوێت پێم بڵێن.

بۆیە دەڵێم گرنگ چونکە شتیان لە من نەدەشاردەوە. ئەگەر شتێك هەبێت و لەمنیان شاردبێتەوە دەبێت شتێکی زۆر گرنگ بووبێت.

یەکەمجار زۆر ترسام لەوەی دەربارەی ڕابردووی من هەواڵێکی تازەیان پێ گەیشتبێت، بەڵام کە سەیری دەم و چاویانم دەکرد نیشانەیەکی وام بەدی نەکرد.

ئەم دۆخە زۆری نەخایاند. پوورە هاجەر کە لە بەرامبەرمدا دانیشتبوو بە دەنێکی هێواش کەمێك بە شەرمەوە وتی:

– کچم سێڤدا! من و شەیدا بیرمان لە بابەتێکی گرنگ کردووەتەوە سەبارەت بە تۆ. وتمان با لە تۆ بپرسین، ڕایەکت وەربگرین. نازانم دەڵێیت چی؟

زۆر مەراقم بوو بزانم چییە، بۆیە بە کەمێك ترس و وریاییەوە وەڵامم دانەوە:

– خێر دەبێت ئینشائەڵڵا.

دووبارە پوورە هاجەر لە ترسی ئەوەی دڵم نەشکێنێت نەیدەزانی چۆن باسەکە بکاتەوە، بۆیە وتم:

– پوورە هاجەر، با بزانم چییە. یەکێکتان بیڵێن توخوا!

– ڕۆڵەکەم! تۆ گەنجیت، جوانیت، هێشتا لە سەرەتای ژیانتدایت. شایەنی ڕۆژانی خۆش و جێگای بەرز و باشی.

زۆر دڵتەنگین کە تۆمان لێرە بەند کردووە. لەبەرئەوە لەگەڵ شەیدا بیرمان کردەوە و بڕیارماندا و کەسێکی چاکمان بۆ دۆزیتەوە.

یەکەمجار زۆر بە وردی تێنەگەیشتم لێیان:

– دەتانەوێت خواحافیزیم لێ بکەن. وانییە؟

پووره هاجەر و شەیدا کە لامەوە دانیشتبوون خێرا بە دڵەساف و گەوهەر ئاساکەیانەوە سەغڵەت بوون:

– نەخێر! بە هیچ شێوەیەك مەبەستمان ئەوە نییە ! تۆ جێگات لە سەر سەری ئێمەیە. نییەتی ئێمە ئەوە نەبوو. ویستمان بەختەوەرتر و خۆشتر بژیت. ویستمان ماڵێکی پڕ بەختەوەری خۆتت هەبێت.

تێگەیشتم...

پووره هاجەر بەردەوام بوو:

– داواکارێکیشمان دۆزیەوە.

زۆر سەرسام بووم بەمە:

– چی؟!! داواکارتان بۆ دۆزیمەوە؟!

– بەڵێ کچەکەم!

وەك ئەوەی لە ناخمەوە هات وتم:

– پووره هاجەر، ئەوەی داواکاری منە یان من ناناسێت یان عەقڵی نیوە ناتەواوە.

– نەخێر کچم هیچیان نییە. هەم تۆ زۆر باش دەناسێت و هەم پیاوێکی تا بڵێی باشە. تاکە عەیبی ئەوەیە کەمێك تەمەنی لە تۆ گەورەترە.

نەمدەزانی چی بڵێم. پێم وانەبوو ئامادەی هاوسەرێتی بم. لەدوای ئەو ژیانە پڕ لە خراپەیە باوەڕم نەدەکرد بە کەڵکی هاوسەرێتی بێم. بۆ من زۆر قورس بوو.

دووەمیش دەترسام لەوەی هەموو جارێك ژیانی خۆم بداتەوە بە ڕوومدا.

بەلام هەر پرسیم:

- ئەم داواکارە کێیە ؟

پوورە هاجەر و شەیدا بە خەندەیەکەوە سەیریان کردم، بەلام پوورە هاجەر وەلامیدایەوە:

- باوکی شەیدا، واتە یوسفی کوڕم.

ئای خوایەگیان!

لە شەرمدا سوورهەلگەڕام. چۆن دەبوو ئەمە ببێت؟ کەسێکی ڕۆشنبیر و بەختەوەری وا کە من باش بناسێت و حالم بزانێت چۆن هەولی شتی وا دەدات؟ تۆ بلێی لەبەر ئەوە وا بکات کە زۆر بەزەیی پێمدا بێتەوە؟!

کەوتبوومە ناو گێژاوێکی گەورەوە. نەمدەتوانی بەم خێزانە بلێم (نەخێر!) وتنی نەخێر گەمژەیی بوو بەلام نەشمدەتوانی بلێم بەلێ. چونکە دەترسام لەژێر چاکەی ئەم مرۆڤانەدا دەرنەچم.

شەیدا بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە پرسی:

- چی دەلێیت سێڤدا؟

سوور هەلگەڕابووم، سەرم دانەواند. دلم زۆر بە خێرایی لێی دەدا، بەلام ناچار بووم شتێك بلێم.

- بوون بە بووکی ئێوە بۆ من شەرەفێکی زۆر گەورەیە، بەلام دەبێت بزانن کە من کەسێکی چۆنم. ئەگەر من دەناسن چۆن بەم حالەمەوە قبولم دەکەن؟ چۆن پێم ڕازی دەبن؟ ئەگەر ئێستاش گوێی نەدەنێ، سبەی و دوو سبەی هەر تێکدەچێت. ئەمە وا بەڕێوەناچێت.

– مەترسە ڕۆڵەگیان، ئێمە باسی هەموو شتێکمان کردووە. هەموومان بە تۆ ڕازین و خۆشمان دەوێیت و دەمانەوێت وەك بووکێك لەمماڵەدا بمێنیتەوە.

– جا با ئێوە منتتان بوێت و ڕازیش بن. بەڵام من چۆن دەتوانم ڕابردووی خۆم لەگەڵ کەسانێکی پاکی وەك ئێوەدا بەش بکەم. چۆن دەتوانم بەم تاوانانەوە ببمە بووکی ئێوە. چۆن دەتوانم بەرامبەر کاك یوسف ڕۆڵی بێ تاوان ببینم.

پوورە هاجەر دووبارە بە سۆز و بەزەییەکی دایکانەوە لە باوەشی گرتم و ماچی کردم:

– ئای ڕۆڵە بەدبەختەکەم! خۆ تۆ بە ویستی خۆت نەچوویتە ناو ئەو تاوانانەوە، بەڵام بە ویستی خۆت هەوڵی ڕزگاربوونت دا. بۆ تەوبەکردن لەو تاوانانە چەندین شەو تا بەیانی فرمێسکت ڕشت. ئێمە دەزانین تۆ بەهۆی دڵپاکی و نیەت پاکی و ساویلکەییتەوە فریودرایت و کەوتیتە ناو ئەو تەڵەیەوە.

تاوانەکان هەرچی بن و هەرچەند بن، سۆز و بەزەیی خوا دەیانسڕێتەوە. ئەو زاتە هیچ کەسێکی تۆبەکار و گەڕاوە لە بەردەم بارەگاکەی وەدەرنانێت. تەنیا ئەوەندە گرنگە کە دووبارە نەکەوێتەوە ناو ئەو تاوانانە. خۆ تۆش هەر بۆ ئەوە هەوڵ دەدەیت.

## یەکەم هەنگاوم بەرەو دونیای پڕ ئاسوودەیی

بە ڕاستی خوای گەورە ڕێزی لێنام و دەرووی خێری لێکردمەوە، ئەمە شتێکی باوەڕپێنەکراو بوو. نەمدەتوانی خەیاڵی ئەوەش بکەم کە ئەو خێزانە من قبوڵ بکەن. بەڵام ئەگەر خوا بیەوێت هەموو شتێك لە جێی خۆیدا دەبێت و دەکەوێتە سەر ڕێ.

ئێوە سەیری کاری خوا بکەن. پوورە هاجەرێك کە هەر لە منداڵیمەوە وەك دایك وابووە بۆم، دەبووە خەسووم و منیش دەبوومە بووکی ئەو.

کاك یوسفیش بەتەواوەتی پیاوێکی پیاوانە بوو.

پاك و ڕاست و ڕێك و پێك...

دڵ و دەروون و قسەی زوبانی وەك یەك...

ژیانی لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا تەرخانکردبوو.

ئەو هەموو تەمەنی بۆ خزمەتی باوەڕ و قورئان تەرخان کردبوو... هەموو دەرد و خەمێکی ئەو، خوێندکارە کەمدەست و گەنجە بێکەسەکان و کەسانی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بوو.

زۆر باشتر لەوەی چاوەڕێم دەکرد پێشوازی لێکردم. لەگەڵ خۆشەویستی و یارمەتی ئەودا توانیمان خێزانێکی بەختەوەر پێکبهێنین.

## ماڵەکەمان بووە قوتابخانەیەك

ماڵەکەمان دەڵێی قوتابخانەیە. نوێژەکانمان بە جەماعەت دەکەین. دوای نوێژەکان بەیەکەوە تەسبیحات دەکەین، هەروەها هەموو جارێك دوای نوێژەکان تەفسیری قورئان دەخوێنین. واتە لە سایەی کاك یوسفەوە ماڵەکەمان بووە قوتابخانەیەك.

ئێستا لەگەڵ کاك یوسف تەنیا نیکاحێك لەنێواندا هەیە. چونکە ئەو تەنیا بۆ ئەوە منی قبوڵ کرد کە لە قسەی دەوروبەر بمپارێزێت ئەگەرنا نییەتێکی تری نەبوو. بەڵام پوورە هاجەر و شەیدا ئەمە نازانن. ئەسڵی ئەم مەسەلەیەش هیچ کەس نابێت بیزانێت. ئەو ئاسوودەییەی لە ماڵەکەدا هەبوو بایی هەموو شتێکە.

لە دوای هەموو ئەوانە بۆم دەرکەوت کە بەختەوەری ڕاستەقینە و چێژ و دڵخۆشی هەمیشەیی لە سایەی باوەڕ و قورئانەوە دەستدەکەوێت. ئەو ئاسوودەییەی کە بەندایەتی خودا دەیبەخشێت لە هیچ شتێکی تردا نییە. هیچ شتێك نییە هێندەی کڕنووش بردن و فرمێسك ڕشتن لە بەردەم ئەو زاتە ڕۆح پاك و خاوێن بکاتەوە و ئاسوودەی بکات. خوای گەورە لە ڕێی ڕاست لامان نەدات.

## دایکم لە خەودا بینی

دوای شووکردنم دایکم لە خەودا بینی. پێم وت:

– چۆنی دایەگیان؟

– زۆر باشم کچە شیرینەکەم. من و کاکت زۆر باشین ، بەڵام هیچ هەواڵێکمان لە باوکت نییە.

ترسی خۆمم خستەڕوو و لە دایکم پرسی:

– دایە! لەوێ چی لە تاوانباران دەکەن؟

دایکم وەك ئەوەی زۆر باش بزانێت چیم دەوێت وەڵامی دامەوە:

– مەترسە کچم. هیچ بەندەیەك بێ تاوان نییە. خوای گەورە ڕەحم دەکات بەو کەسانەی تۆبە دەکەن و تاوانەکانیان دووبارە ناکەنەوە. سۆز

و بەزەیی ئەو زاتە هەموو شتێکی گرتووەتەوە. لە ڕەحمەتی خوا بێئومێد مەبە. بەردەوام بە لەسەر بەندایەتی و تۆبەی خۆت. زۆر بیرت دەکەین. لێرە جێمان بۆ تۆ داناوە چاوەڕێت دەکەین.

بە ئاگا هاتمەوە... بەڵێ... دەبێت خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەو مردنەی هەموو کاتێك ئەگەری ئەوەی هەیە ڕێم پێ بگرێت. ئەگەر بەبێ ئامادەیی ڕێمان پێ بگرێت، زۆر پەشیمان دەبینەوە. ئەوە گەڕانەوە و قەرەبووی نییە!

خوای گەورە هەموومان لەو بەندانە بگێڕێت کە پێش مردن خۆیان بۆ ئامادەکردووە! بمانکاتە بەندەیەکی شایستەی خۆی!!

خوایەگیان! ڕەحم بە گەنجەکان بکەیت نەبنە قوربانیی و دووچاری ئەو هەڵانە نەبن کە من تووشی بووم! عەقڵ و هەستییان پێ ببەخشە تاوەکو خۆیان نەخەنە ئاگرەوە.! هاو وێنەی کەسانی چاکەخوازی وەك پوورە هاجەرو کاك یوسف زیاد بکە!... ئامین...

# پێڕست

# SEVDA

## Bir gençlik dramı

## HALİT ERTUĞRUL

سێڤدا، باس لەژیانی کچێکی لاو دەکات کە بەدوای خەیاڵە ئەرخەوانیەکانی گەنجیدا وێڵە و سەر لەکۆڵانە تاریك و بن بەستەکان دەردەکات. زنجیرەی ڕووداوەکان هێندە سەرسوڕهێنەر و کاریگەرن کە مرۆڤ لەخۆی دەپرسێت "ئاخر تا ئەو ڕادەیەش؟!"

سێڤدا، ئاوێنەی ژیانە لەناو دنیای سەرنجڕاکێش و پڕ ئەندێشەی گەنجانی ئەم سەردەمەدا.

لەلاپەڕەکانیدا هەموو لاوێك چەند دیمەنێك لەژیانی خۆی بەدی دەکات.

هەر بەسەرهاتێك کە لەم کتێبەدا دەیخوێننەوە، ڕووداوێکی پەندئامێزتان نیشان دەدات و یارمەتیتان دەدات بەخۆتاندا بچنەوە. لەهەمووشی گرنگتر، واتان لێدێت بە پەرۆشیەوە ساتێك خێراتر پێشنیاری ئەم کتێبە بکەن بۆ دۆستان و هاوڕێیانتان.

بۆ ئەو دڵانەی بەرگەدەگرن...

ISBN 0-0133-0000-8




نرخی (٣٠٠٠) دینارە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
ARA Media Center
ara.m@hotmail.com